## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: گەنجەکانمان بـــەرەو کـــوێ...؟
بابەت :
نووسینی : مەلا ئەحمەدی قامیشی
کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا
چاپ / چاپی سێیەم/ ٢٠١١
شوێنی بڵاوکردنەوە: (( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی ))
بۆ کارە هونەرییەکان و چاپکردن ( ٠٧٥٠١١٨١٩١٩ )
بۆبڵاوکردنەوەو دابەش کردن ( ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ )

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٣٥٠ )ی ساڵی ( ٢٠٠٥ )ی پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد الله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه ومن والاه...وبعد:

مادام لاوان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لەگۆڕانکارییە ڕامیاری وکۆمەڵایە تییەکانداو جڵەوی کۆمەڵگە بەدەستیانەوەیە بەرەو هەر مەنزڵێکی، بەرن بەختەوەری بێت یان بەدبەختی، ئەوان لەناوجەماوەردا ئالییەتێکی دیاروبەرچاون لەجێبەجێ کردنی گۆڕان وەك خوای گەورە فەرمویەتی: (ان الله لايغيرما بقومٍ حتى يغير ما بِانفسِهِم).

ئیتر ئەو گۆڕانکارییە بەرەو چاکە بێت یان خراپە ئەوان پێشڕەون.وەکو چۆن شۆڕشە ئیمانییەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەسەرەتاوە کۆمەڵە گەنجێکی خودا ویستی وەك (بیلال وسوهەیب وخەباب وعەممار وسومەییە) لەدەوری کۆبونەوەو بوونە پێشەنگی کاروانی ئیمانی و گۆڕانی ئیجابی بەپشتیوانی خودا گەورەترین گۆڕانکارییان بەرپاکرد لەناو گەلێکی زۆر دواکەوتوو !



وەك پێشەواکەمان فەرموویەتی هەرلەسەرەتای ئاشکرا کردنی پەیامەکەوە (حالَفَنی الشباب وخالَفَنی الشیوخ) واتە: گەنجەکان بونە هاوپەیمان وپێشوازییان لێکردم بەلاَم پیرەکان سەرپێچییان کرد.

کەواتە دەبێت بایەخێکی زیاد بە نەوجەوانان ولاوەکانمان بدەین کەئومێدی نەتەوەکەمانن، بەرنامەی دروستیان بۆداپڕێژین، ڕێگە نەدەین بێ ئامانج لەژیانیاندا بسوڕێنەوە، یان خەڵکێکی دەروون نەخۆش بەبیرو بۆ چوونی لاروخواربەرەوهەڵدێریان ببات وەهەروەها دەبێت لاوەکانمان لەسەرەتاوە فێری ئیسلام بکەین بەجۆرێك دڵنیابن لەوەی کەئیسلام چارەسەری سەرجەم کێشەکانی تێدایە، ئەم دینە بۆ بەڕێوە بردنی ژینە، وەهۆشیاریان بکەینەوە تاوەکو بەئەندازەی پێویست لەدین و دنیایان بەئاگابن وەفەرمان بکەن بەچاکەوڕێگری بکەن لەخراپە ئەوەش ئەرکی سەرشانی هەمووانە، ڕێنمایی وئامۆژگاری پێشەوا کەمانە:(کلکم راعٍ وکلکم مسؤل عن رعیتهِ ...) و(من رای منکم منکراًفلیغیره بیده...).

بەتایبەت کەگەنج لەولاَتی ئێمەدا لە قەیراندایەو بوەتە قوربانی،چونکە سیستەمی بەڕێوەبردنی ولاَت حیزبیەالەجیاتی پێوەری زانستی وهاولاَتی بوون، هێشتا گەنجەکانیش لەئاستی گۆڕان دانین تابەگژ گەندەڵیەکاندا بچنەوە، وە زۆرێك لەگەنج ولاوە



کانمان بەهەندێ دروشمی بریقەدار چەواشە کراون ولەجیاتی گرنگیدان بەزانست وبەها بەرزەکان، خۆی سەرقاڵکردووە بەدیکۆروپوکەشی دەرەوە! نرخی وەرزی جوانی خۆی نازانێ وتا کاتێ زانی کەلەدەستی چوو! پەشیمانیش دادنادا..بۆیە وەك ئەرکی سەرشان،وەك دڵسۆزیو پەرۆشیەك بۆ لاوەکان دەستم دایە نووسینی هەندێ لە پەتای کوشندەی تەمەنی گەنجێتی، بەئومێدی بەرچاو روونی بۆ هەموو لایەك بەتایبەت توێژی لاوان وهەرزەکاران، خوا لەکەموکوڕیەکانمان ببورێت وئێوەش لەدوعای خێربێبەشمان مەکەن.

واللە الهادی الی سواءالسبیل

مەلا ئەحمەدی قامیشی
سلێمانی/مزگەوتی شەفیق بەگ
مۆبایل/ ٠٧٧٠١٤٧٣٩٠٢



## گرنگی ڕۆڵی گەنج

گـرنگترین قۆنـاغی تەمـەنی ژیـانی مـرۆڤ سـەردەمی گـەنجی و هەرزەکارییە ، چونکە ئەو بەهرەو هێزو توانایەی لای گەنجە لای منداڵ و پیر دەست ناکەوێ، لەبەر ئەوەیە کەئەرکە گرنگەکانیش زیاتر ڕوو لە گەنج دەکات بەرانبەر بەخواو پاشان لەخزمەت گەل و نیشتیمان، ئەو گەنجییەتی و لەش ساغیەش کاتییەو بەهار ئاسا زوو تێدەپەڕێت و دەڕوات ، کە لەدەستت چوو بەخۆزگەو ئاوات خواستن ناگەڕێتەوە، قەدرو ڕێزی گەنجایەتی ئێستا لای خاڵە پیرەکانە بەڵام لەدوای چی، شاعیرە پیر جوانی بۆ چووە کەوتویەتی: (لَيتَ الشبابَ يعود يوماً فاَ خبرهُ بِما فَعَلَ المشيب) خۆزیا گەنجایەتیم تەنیا ڕۆژێ دەگەڕایەوە تاکو هەواڵم پێدەدا کەپیری چی لێکردووم، بۆیە پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لەفەرموودیەکی پیرۆزیدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەو هەلە زێڕینەی تەمەن بقۆزنەوە پێش ئەوەی لەدەستتان بچێت فەرموویەتی:(إغتَنم خمساً قبل خمسٍ..)پێنج شت پێش پێنج شتان بە فرسەت بگرن، مەیەڵن بەلاش لەدەستتان دەربچن لەوانە: ژیانەکەت بەفرسەت بزانە پێش ئەوەی مردنت بگاتێ وەلەناو هەموو قۆناغەکانی تەمەندا کاتی گەنجی و لاوی جیا کردوتەوە وفەرموویەتی:(وَشَبابِكَ قَبل هِرَمِكَ) واتە: گەنجایەتییەکەت بەهەلبگرە پێش ئەوەی پیر ببی ..! وەکاتی لەشساغیت بەهەلبگرە تانەخۆش نەبووی، وەدەوڵەمەندییت بەهەل بگرە تا هەژار نەبوی ،

وەكاتی بێكاری بەفرسەت بزانە تا سەرقاڵ نەبوی.چونكە ئەم پێنج هەلانـەی کـە خۆشەویـستمان بـۆی دیـاری کـردوین زۆر گـرنگ و بایەخـدارن وەلەگەڵ ئەوەشـدا کـاتین و نـامێنن ، جـا ئـەو گەنجـەی تەوبەکارو چاکەکارە، بۆ گەلی موسوڵمانی خزمەتکارە، پلەو پایـەی بەرچـاوو دیـارە ، لەقیامەتیـشدا سـەربەرزو سـەردارە، بەڵگـەشمان فەرمودەی پێغەمبەری نازدارە، کـە فەرموویـەتی لـەو بـارە:(لەڕۆژی دوایدا حەوت دەستە و تاقم یان حەوت کـەس هـەن لـەژێر سـێبەری عەرشی خوادا حەشر دەکرێن لەو ڕۆژەدا خەڵکی لەگەرماو ئارەقی خۆیانـدا ڕوودەچـن وهـیچ سـێبەرێك نییـە، جـا یـەکێ لـەو حـەوت کەسانە: (شاب نَشأ فی عبادة الله) واتە: گەنجێك بەعیبادەتی خـوا پەروەردە بوبێ ، بۆیە ئەو ڕێزەی دراوەتێ چونکە گەنج زیاترحەزو ئـارەزووی زاڵـە، نـەفس و شـەهوەتی بـەهێزە، جـا ئـەو نـەفس و ئارەزووەی لەبەرخوا کۆنترۆڵ دەکات و بەدوای حـەرام ناکـەوێت و بـەرگی تـەقوا دەپۆشـێت، بـێ فـەرمانیی خـوا ناکـات، ئـەوا خـوای گـەورە پاداشـتی بەوەدەداتـەوە کـە لـەژێر سـێبەری عەرشـی خـۆی ڕایدەگرێت ، ئەگـەر گەنجەکانمان ڕۆشنبیروچاو کراوە بوون ئەوا گەلەکـەشمان پـێش دەکـەوێ، ئەگەرئـەوان خووڕەوشـتیان جـوان بوودەست و دامێنیان پـاك بـوو، ئەوا کۆمەڵگەکەشمان چاك وپـاك وبەختەوەر دەبێت، ئەگـەر ئافرەتـان خـوا نـاس وتێگەیشتوو بـوون ئـەوا کاریگـەری ئیجابیـان دەبێـت لەسـەر مێـردو منداڵـەکانیان ، بەڕاسـتی هەرگـەنجی خـوا ناسـە کەدەبێتـە داری بـەری بـۆ کـەس



وكاری، میللەت لەبەری دەحەسێتەوە (ابن عباس) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرموویەتی: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە بەگەنجیەتی نەبێ، ئێستا ڕێزی گەنجایەتی لای پیرانە، هەر وەك قەدری چاو لای كوێرانە ، كەئێستا بۆی پەشیمانە ، تۆش سەرنج بدە وبڕوانە، لەدەست تۆش دەڕوا بەمزوانە، جا تكایە قەدری بزانە.

## نەخشە و پیلانی نەیاران بۆ لادانی هەرزە كاران

لەبەر ڕۆڵ و گرنگی كاریگەری چینی گەنج لەناو كۆمەڵگادا، بۆ هێنانەدی مەرامەكانی خۆیان، ناحەزانی ئیسلام شوێنكەوتووانی ڕێبازی شەیتان، بەردەوام نەخشە و پیلانی ژەهراوی دادەڕێژن بۆ لادانی گەنجەكان لەفیترەتی پاكی خۆیان كە ئیسلامە، بەهۆیەكانی ماددی و مەعنەوی بەكەناڵەكانی ڕاگەیاندن، بەبڵاوكردنەوەی مۆدێلی خراپی گاورو جولەكە، بەتێكەڵاوكردنی كوڕ وكچ لە خوێندنگاكان ، بەكردنەوەی بەناو سەنتەری گەنجان، جارێك بەناوی ئازادی و سەربەستی و یەكسانی و مافی مرۆڤ كە (ئەمانە پێویستن و لەدینەكەی خۆماندا هەن) هەر جارە بەدروشمێكی بریقەداری بێ ناوەڕۆك بۆ تێركردنی ئارەزووە كانی خۆیان بەڕێگەیەكی ئاژەڵانە گەنجەكانمان چەواشەدەكەن و لەڕاستەڕێ لایان دەدەن ، وەبۆ ئەو گەنجانەیش كەپابەندی مزگەوتن تۆوی ئاژاوەو دووبەرەكییان بۆ بڵاو دەكەنەوە ، لەڕێگەی



حیزب و جیاوازییە فیقهییەکان و لەناو ماڵی خوا چەندین دەستەو تاقمی وەك سۆفی و سەلەفی وتوندڕەوو میانەڕەوو موسوڵمانی عەلمانی و دیموکراسی......، دروستکراوە کە لەجێگەی برایەتی زۆر جار ململانێی یەکتردەکەن! بەپیلانی ناحەزانی ئیسلام، دیارە ئەنجام دانی ئەم چەواشەکاریە پارەی زۆرو ڕاگەیاندنی بەهێز لەخزمەتدایە بەهاوکاری خەڵکانێك کەلەبەرگی ديندا بێ دینی ئەکەن •

ئەمەو بەدەیان نەخشە وپلانی تر کەوتنە هەوڵدان بۆ چەواشە کردن و بێهۆشکردنی گەنجەکان بۆ ئەوەی بتوانن لەکارەکەیاندا سەرکەوتووبن، وەکو دکتۆرێك گەر بییەوێ نەشتەرگەرییەك ئەنجام بدات بۆ بڕینی ئەندامێکی لاشەی نەخۆش دەبێت نەخۆشەکە بێ هۆش بکات بەماددەی سڕکەر و پاشان کاری خۆی دەکات ، ئەوانیش بەهەمان شێوە بۆ لەتکردنی لاشەی ئیسلام ، هەڵسان بەسەرقاڵ کردنی گەنجەکانمان بەشتە لاوەکییەکان بەتایبەت لەڕێگەی تێرکردنی ئارەزووەکانیان بەهەر شێوەیەك بێت!وەدوور خستنەوەیان لەپابەندییان بەئیسلامەوە، بێگومان زۆر مەترسیدارە (گەنج بی وبەنج بی)جا بۆئەوەی کاریگەری ئەو بەنجە سڕکەرە بەتاڵ بکەینەوە کەداویانە لەلاشەی ئیسلام ، بۆ ئەوەی نەخشە و پیلانی نەیارانی ئیسلام پوچەڵ بکەینەوە دژ بەهەرزەکاران ، پێویستە بەئاگا بێینەوە بزانین ئەو ئیسلامەتییەی ئێمە ئەنجامی دەدەین عەیارە چەندە ؟ ئایا دین هەر لەناو مزگەوتەو هیچی تر ؟



ئایا ئەو ئافرەتە گەنجەی نوێژ دەکات واتە موسوڵمانە بەڵام ڕووتەو لەتێکەڵی پیاوانی بێگانە سڵ ناکاتەوە دەشبینم خێر دەدات بەسواڵکەر تاچەند لەگەڵ دینەکەی دەگاتە٠٠،جا بۆ ئەوەی چیتر ئەو فێڵەتان لێ نەکرێ:(هەتا گەنجی بلەوەڕێ کەپیربوی وەگەڕێ)یان تۆجارێ گەنجی کەپیر بووی تەوبە بکە کێ دەڵێ ئەگەی پیرببی، دارێ کەبەتەڕی دانەیە چۆن بە وشکی دەچەمێ! ئەی نازانی کەبەمناڵی پەروەردەی نەکەی دوایی فێری دینداری نابێ و لەدەستت دەردەچێ و کوڕی تۆ نامێنێ! جا بۆئەوەی گەلەکەمان لەفەوتان ڕزگار بکەین و سەر بەرزی دنیا و دواڕۆژبێ، پێویستە بگەڕێنەوە بۆ پەروەردە کردنێکی ئیسلامیانەی مناڵەکانمان، بۆ ئەوەی هۆشیارو بەئاگابین، لەدین ودنیامان شارەزابین، تا لەنەخشەوپیلانی نەیاران سەلامەت بین.

## هۆشیاری گەنجان بەرانبەرپیلانی نەیاران :

ئەمڕۆ موسوڵمانان لەڕۆژگارێکی ئاڵۆزدا دەژین ، بەهۆی کاریگەری شارستانیەتی ڕۆژ ئاوا لەجیهاندا ، چ لەبواری پێشکەوتنی زانستی و دەستکەوتە مادییەکان یان لەبواری فەسادی هونەریو ڕۆشنبیری جۆراوجۆر، کەبانگەشەی بەرەڵایی دەکەن بەناوی ئازادییەوە نرخی مرۆڤەکانیان دابەزاندووەتە ئاستی ئاژەڵەکان!! بێگومان ئەم گۆڕانەش لەناکاووبێ پێشەکی نەبوو، بەڵکوو بەهۆی بێ ئاگایی ولاوازی بیر وباوەڕو پشت گوێ



خستنی یاساکان وچەوساندنەوەی سیاسی وکۆمەلآیەتی لە ناوخۆدا، وەپاشان داگیرکرانی ولآتانی ئیسلام لەلایەن بێ بڕواکانەوە وەداڕشتنی بەرنامەیەکی ژەهراوی بۆ پەروەردە وفێرکردن، تائەندازەیەکی باش توانییان موسوڵمانان ناچار بکەن بەئیسلامێکی ڕواڵەتی بەناوێکی بێ ناوەڕۆك ڕازی بن، وەك دکتۆر (زوەیمەر) سەرۆکی زانکۆی ئەمریکی لەکۆبونەوەیەکی مەسیحیدا لەقودسی پیرۆز لەسییەکانداو تبوی (بەهۆی کاری بەردەوامان لەولآتە ئیسلامییەکاندا توانیمان چینێکی تازە لە موسوڵمانان دروست بکەین کە موسوڵمانن بەلآم دوورن لەئیسلام !)ئیسلام لەدۆڵێك وئەوان لەدۆڵێکی ترا ئێرانی گوتەنی ئیسلامێکی دیموکراتی وەك بینیمان یەکەم سوتەمەنی ئەو بیرە پوچە ناو ماڵی موسوڵمانان بوو، ژیان لەناو ماڵەکاندا گۆڕا لەدینێکی ڕاست بۆئیسلامێکی کەم وکورت وبێگیان حەیاوحورمەتیان نەهێشت،ئارەق خواردنەوەو تێکەلآوی هەردووڕەگەز لە یاریگاکان سەیرانگاکان، وهۆڵی ئاهەنگەکان ٠٠بەیەکگەیشتنی کوڕان وکچان، بەناوی هاوڕێیەتی ودڵپاکی ویەکسانی! لەبەرکردنی جل وبەرگی تەنك وتەسك و فریودەرابەکار هێنانی بۆن وبەرامەی لەڕادە بەدەرو زۆر کاریگەر.. بەسەر بردنی زۆربەی تەمەن بەبەرنامەکانی سینەماو تیڤی و سەرجەم ڕاگەیاندنەکان کەتەواوسەرقاڵیان کردوین لەژیان..! لە سەرجەم بوارەکانەوە ژیانیان ئاڵۆز کردووە، زۆربەشیان لەخزمەتی بێ دینی دان !



لەبەرانبەر ئەوەدا ڕابونی ئیسلامی هاتە کایەوە ،موسولمانان کەوتنە خۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی نەیاران و هەولدان بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕەسەنایەتی، بەرەو یەکتاپەرستی، لێرەدا کوڕانی ڕابوونی ئیسلامی کەوتنە قۆناغێکی سەخت و گران، نامۆ بوون لەناو گەلدا لەناو ئیسلامدا ئادابی ئیسلامی غەریب بوو، لە مالە کەی خۆیدا لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی کێشەی بۆ درووست دەبوو ! لەکاتێکدا ئەوبانگخوازانە زۆریش دلسۆز بوون بەرانبەر بەدین ونەتەوەکەشیان بەلآم لەبەر :

- گرتنی لایەنێکی ئیسلام بەتووندی وفەرامۆش کردنی لایەنەکانی تر.

- پەلەکردن لەچاك کردنی خێزان،چونکە ئەونازانیٚ پێشتر چۆن لادراون کراون.

- بیٚ ئاگایی لەبەکارهێنانی شێوەی پەروەردەیی ئیسلامی تازە، کە دووچاری توند و تیژی دەکردن .

- نەشارەزایی لەیاساکانی ئیسلام وبیٚ ئاگایی لە دەوروبەرو لە ڕۆژگار •

- جا بۆ ئەوەی خۆی ودینەکەشی ناشرین پیشان نەدات، بۆ ئەوەی کارەکانی لەدنیادا سەر بگریٚ و لەقیامەتیش بەر بگریٚ، پێویستە دینەکە وەکو خۆی بناسیٚ و بزانیٚ، پاشان پێکەوە گرێدانی شارەزایی شەرعی و ڕۆشنبیری هاوچەرخ، بەکارو کردەوەی حەکیمانە ورەوشتی موسولمانانە خزمەت بکات ، واتە

بەکردەوە ڕۆشنبیر بێت نەك بەقسەو وتار، جابۆ ڕزگار کردنی گەلەکەی و ڕازی کردنی خوا پێویستە ڕۆشنبیری و چاکی و پاکی لەکردارو گوفتاری گەنجانی موسوڵمان ڕەنگ بداتەوەو جیاواز بێت لە بەناو سەقافەتی غەربی و ئەورووپی.

## چاولێکەری دەردێکی کوشندەیە:

پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ)فەرموویەتی(مَن تشبَه بقَوم فهو مِنهم)(رواه ابو داود ) واتە هەر کەسێك خۆی بەقەومێك بچوێنێ ئەوا ئەو کەسە لەوانە چاولێکەری دەردێکی کوشندەی کۆمەڵگای کوردەواریمانە ،هەر شتێك لەدەرەوەی خۆمان ناردیان بێ چەندو چون وەری دەگرین بێ لێکدانەوەی چاك وخراپی، نازانم ئەم کارە ناو بنێم چی؟ زاڵبونی فەرهەنگی بێگانە ویستی؟ یان لەشتی خۆماڵی وەڕەز بوون؟یان تەنها چاولێکەری کوێرانەیەو بەس یان بڕوا بەخۆ نەبوون!! ئەوەی زیاتر جێگای داخە ئەم دەردە کوشندەیە بەنیشانەی پێشکەوتن و شارستانی دەزانن ! یان بە کوردایەتی لەقەڵەم دەدەن ! کار گەیشتۆتە ئەوە کەچاولێکەری بێ بڕوایان هەموو بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە،جارێك بەمۆدێلی چاك یان بەناوی مۆدێرن ونوێخوازی و جارێك بەناوی سیستەمی نوێی جیهانی و هەر جارە بەناوو ڕەنگێ ئەینەخشێنن! ئەوەی کەجێگەی سەرسوڕمانە دابو نەریتی ڕەسەنی کوردییە کەزۆربەی لەئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە ، بەرەو توانەوەیە بەتایبەت جل

و بەرگی كوردی پیاوان و ژنان كەساڵانە تەنها بۆ نەورۆز وبۆنەكان
ئەیكەنـە بـەریان، لەكاتێكـدا لاف كوردایـەتی لێـدەدەن ،حكومـەتی
كوردی وشۆڕشی كوردی ، بەڵام لەسەر دین و دابو نەریتی بێگانە،
لـەكوێ عـەرەبێك جلـی كـوردی كردەبـەر، لەشـارەكەی خۆشمـان
بەرگی كوردی نامۆیە و بەچاوێكی سووك سەیری دەكرێ، ئەگەر
كار ئاوا بڕوات پاش چەند ساڵێك هەركەس جلی كوردی لەبەر
بكات منداڵ ئەكەوێتە شوێنی ! جگە لەكاتی نەورۆز ، ڕۆژێك بۆ
شاهیدییەك چومە دادگای سلێمانی بەجامانە وجلی كوردییەوە
ئافرەتێكی سفور دانیشتبوو بەفیزێكەوە وتی (حاجی پەنجەو
بێنە)، منیش وتم قەڵەمەكەو بێنە كاتێ ئیمزام كرد وتی ببورە
دیارە مامۆستای وتم ئەرێ تۆ وادەزانی هەرچی ئەم بەرگەی لەبەر
بوو دواكەوتوو نەخوێندەوارە ؟ ئەمە بەرگی ڕەسەنی باوك و
باپیرانتە پاشان وتم من بڕوا نامەی بەكالیۆریۆسم هێناوە لەبەغداد
وبەم بەرگەوە شانازی دەكەم، بەڵام توخوا ڕاست پێم بڵێ تۆ سێی
ناوەندیت بڕیوە لێرەی یان واستەیە .....پاشان داوای لێبوردنی
كـرد . لێـرەدا دەمـەوێ فەرموودەیـەكی پێغەمبـەرتان (ﷺ) یـاد
بخەمەوە كە وەكو موعجیزەیەك ئێستا بەرجەستە بووە كەئەمە
كوردییە كەیەتی (لەمەو دوا شوێن ڕێبازی قەومی پێش خۆتان
دەكەون ، بست بەبست وگەز بە گەز، تەنانەت ئەگەر یەكێكیان
بچێتە ناو كونی سەر مارەڵەوە ، ئێوەش دەچنە ناوی ) (حاكم
گێڕاویەتییەوە) ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرە ئێستا هەموومان

بەچاوی خۆمان ڕۆژانـە لەناویـدا دەژیـن ، هـەر مۆدێلێك لەكەناڵـە ئەورووپی و غەربییەكان نیشاندرا ئـەوا ڕاستەوخۆ لێرە پیادەی دەكەن، بێ ئەوەی بیر لەئەنجامە خراپەكەی بكرێتەوە، خۆ چواندن و لاساییكردنەوەی بێگانە كەسایەتی ئەو مرۆڤە ون دەكات چونكە بەچـاوی خـۆی نـابینێ و بەعـەقڵی خـۆی بـیر ناكاتـەوە، بـەڵكوو بەچـاوو عـەقڵ و بـیری ئـەوان كـار دەكـات ، لـە لایـەكی تـرەوە ئـەم دیاردەیـە نیشانەی لاوازییـە چـونكە لاوازوبێهێـز لاسـایی بـەهێز دەكاتەوە ، لاسایی كردنـەوەی بێ بڕوایـان لـەجل و بەرگ و داب و نەریتیانـدا سـەر دەكێشێ و لاسایی كردنـەوەیان لـە بیر و بـاوەڕ و بیرۆچـكەكانیاندا . بـەڵام فەرموودەكـە لاسـا كردنـەوەی بێگانـە لەپیـشەسازی و زانـستە بەسـوودەكانیان ناگرێتـەوە، چـونكە (حیكمـەت بزربـووی بـڕواداره لەهـەر شـوێنێك پێـی گەیـشت ئـەو شایستەترە بەهەڵگرتنـەوەی)ئـەرێ گـەنجانی موسوڵمان (لـەكوڕان وكچان) ئەمڕۆ لەكوێی ئەم فەرمودەیەدان ؟! بەداخەوە كەهەندێ لە گەنجەكانمان چونەتە سـەرداب ونـەریتی ئـەورووپی و غەربیـەكان تەنانەت لە بێگانە پەرستیدا ئەوەندە پێشكەوتون!بەرگی ڕەسـەنی خۆیـان تـەنها لـە بـەهار ونـەورۆزدا بـۆ سـەیران وێنـە گـرتن لەبـەر دەكەن ! هەندێ لە ئافرەتانیش لەجل و بەرگ و جوانكاری و نینۆك درێژ كردن خۆیان بە ئافرەتانی بێگانە دەچوێنن، كەنەخشەسازی جولەكـەی جیهانییـە بـۆ لادان ومـاڵ بـەفیڕۆ دان ویـاری كـردن بەعـەقڵی مرۆڤـەكان.... بۆ چارەسـەركردنی ئـەم دەردە كوشـندەیە



دەبێ موسوڵمانان جارێکی تر بەخۆیاندا بچنەوەو بە ئاگا بن بەناوی پێشکەوتن و تازە گەری یان بەناوی کوردایەتی فێڵیان لێ نەکرێ‌و دوچاری لاسایی کردنەوەی کوێرانە نەبنەوە، بەڵکوو پێویستە:- بەعەقڵی خۆمانە بیر بکەینەوە لە جیاتی عەقڵی بێگانە -بەچاوی خۆمان بڕوانین نەك بەچاوی بێگانە. ڕەسەنایەتی خۆمان لەدەست نەدەین و دەست گرتوو بین بەڕێبازی باپیرانمان کە ئیسلامە، چون پابەندیمان بەئیسلامەوە ژیان ژیارو پێشکەوتنەو دین ڕێگرنیە لەکوردایەتی و پێشکەوتن، لەهەمان کاتدا سود لەتەکنەلۆژیاکەشیان وەربگرین ، بەڵام نەك توانەوە لەناویاندا .

## گەنجانی ئەمڕۆ ودوێنێ

مادام لاوان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لەگۆڕانکارییە ڕامیاری و کۆمەڵایەتیەکاندا وجڵەوی کۆمەڵگە بەدەستیانەوەیە بەرەو هەر ئاراستەیەکی بەرن ئیجابی یان سلبی وئەوان لەناو جەماوەردا ئالیەتێکی دیاروبەرچاون لەجێبەجێ کردنی ئایەتی گۆڕان و هەنگاونان و داهێنان (إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ) بۆیە ناحەزانی دین بەردەوام لەسەنگەری لادان وچەواشەکردنی گەنجاندان، ئەوەش لەمێژووی دوورو نێزیك دا دیاروبەرچاوە،کاتێ سوپای فەرەنسا هەوڵیاندەدا بۆ گەڕاندنەوەی (ئەندەلوس) کەدەکاتە ئیسپانیای ئەمڕۆ جاسوسیان نارد



بۆئاگاداربوون لەهەست ونەستی موسڵمانەکانی ئەویٚ،ڕۆژێکیان جاسوسێك مێردمندالێکی بینی بێتاقەت بوو پرسی بۆچی وابێتاقەت وداماوی؟ ئەویش وتی ویستم بەدار لاستیکەکەم دووچۆلەکە بکوژم بەلاٚم هەریەکیان بەرکەوت، جاسوسەکە وتی جا ئەوە چیەوخەمی بۆچیە، ئەمیش وتی: بۆ ئەوەی لەداهاتوودا ڕابیٚم کەهەرکاتیٚ سوپای دوژمن دای بەسەرمانا بەیەك تیردووسەرباز بکوژم! جاسوسەکە لەڕاپۆرتی مانگانەیدا نووسیبووی لەم کاتەدا هەرچی بکەین سەرکەوتوو نابین چونکە لاوەکانیان خاوەن پەیام و بەرنامەن، دوای بیست سالٚ هەمان جاسوس گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنە بۆپرسیارو ڕاپرسی و ئاگاداربوون، سەرنجی دا هەرزەکارو گەنجەکانیان سەرقالٚی خۆشگوزەرانی و ڕابواردنن، چووبەلای گەنجێك داکەلەپارکێکدا دانیشتبوو خەمبارو بێتاقەت، جاسوس پرسی خێرە وابیٚ تاقەتی لەم جەوە خۆشە؟ ئەمیش ووتی مەوعیدێکم هەبوو لەگەلٚ یارەکەمدا بەلاٚم کاتەکەی لایداوەوهەر چاوەڕوانم ودیارنییە!! سالاٚنی پێشوو خەمی چیان بوو ئێستا خەمی چییانە! ئەم جارەیان لە ڕاپۆرتەکەیدا نوسی بۆ فەرەنسا کە بەدڵنیایەوە سەردەکەوین بەسەریاندا و ئەندەلوسیان لێوەردەگرینەوە، چونکە هەست ونەستی گەنجەکانیان گۆڕاوە بۆ ڕابواردنو خەمی دینو نەتەوەیان کەمبووەو هەرکەسەخەمی خۆیەتی! ئەوە بووسەکەوتن، جا ئەگەر ئەم ڕوداوە بەراورد بکەین لەزۆربەی لاوانی ئەم

ڕۆژگارە.. بەئاشكرا بۆخۆی دیارە... هەركەسە چاوەڕێی یارە... گەل ولاٌتیش درابەپارە! نەوەی نوێی حازرخۆری بەرسێبەر ئازاد كراوی ئازار نەدیو لەباشوری كوردستان، بەدێوجامەی دۆلار بارانی كتوپڕی بێ ڕەنج وسەیارەی ڕۆژئاواوكلیپی گۆرانی بە دیمەنی ژنانی ئەوروپاوە! بەپیلانێكی درێژخایەن لەخشتەبراون، لاوی ئەورووپی گیرۆدەی ماددەسڕكەرەكانن لاوی كوردیش گیرۆدەی مۆدیلی سڕكەر و دەردی زەدەیی بونە، كە هەردووكیان كوشندەن و پێویستە چارەسەربكرێن، لاوی كورد نیشتمانیان لەبیرنیە! دلٌسۆزیان بۆدین وخاك و نەتەوە نەماوە !بێگومان لەدەستدانی لاوان لەدەستدانی پاشەڕۆژە.سەرنج بدە پەند وەربگرە لەبەسەرهاتی حەزرەتی یوسف (علیه السلام) كە پێشەوا سەر مەشقی گەنجانی خواناسە، گەردەتەوێت خوابتخاتە ژێرسێبەری عەرشی خۆی لە ڕۆژی قیامەت بكەوێتە بەر فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)(...شاب نشا فی طاعة الله) ئەوا گەنجێكی دەست ودامێن پاك بە، بێ ئاگاو لەخۆبایی مەبە.

## پیاوانی بەشێوە ژن

نابێ پیاوان خۆیان بەئافرت بچوێنن وەبە پێچەوانەوە: (لَعَنَ رسول الله (ﷺ) المتشَبهِينَ من الرجالِ بالنساءِ والمتشبهاتِ من النساءِ بالرجال)) رواه البخاري وغيره.

واتە:پێغەمبەری خوا نەفرەتی لەو پیاوانە کردووە کە خۆیان بەئافرەتان دەچوێنن ، وەنەفرەتی لەو ئافرەتانە کردووە کەخۆیان بەپیاوان دەچوێنن پێچەوانەوەچونکە هەریەکەیان بەسروشتی خۆیەوەجوانە، لەگێڕانەوەی (ابوداود)دا خۆشەویستمان فەرموویەتی: (لەئێمە نییە ئەو ئافرەتانەی کەخۆیان بەپیاوان دەچوێنن، وەئەو پیاوانەی کەخۆیان وەك ئافرەت نیشان دەدەن).

پوختەی فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنێ کەپیاوانی بەشێوە ژن و ژنانی بەشێوە پیاو دوورن لەسروشتی خۆیان ولە ڕەحمەتی خوا ، هۆیەکانی قەدەغەکردنی ئەم دیاردەیە زۆرن لەوانە : بەجێهێشتنی شوێنەوارێکی مەترسیدار لە دڵ و دەروونـدا، جا ئەگەر ئافرەت خۆی بەپیاو بچوێنێ ئەوا مەیلی بەلای کردەوەکانی پیاودا دەچێت و سروشتەکەی دەگۆڕێت و مێینیەکەی لەدەست دەدات ، وەکو ئەوانەی کەلەبەرگی سەربازی یان پێشمەرگایەتی دان و کاری دەرەوەو ماڵەوەیان پێ دەکەن و بەم کارەیان ستەم لەخۆیان دەکەن !بێگومان ئەم کارە زۆر لەخۆکردنەو گۆڕینی فیترەتیش مەرگەساتە، وەپیاویش بەهەمان شێوە.



یەکێکی دیکە تر لەمەترسییەکانی (تشبە) خۆچواندن ئەوەیە :کەلەلەشی مرۆڤدا چەند گلاندێك هەیە کە هۆرمۆنی نێرینە و مێینە دەر دەدەن بەرێژەی پێویست ، جا ئەگەر ئافرەت خۆی چواند بەپیاو چ لە جل و بەرگیدا یان لەجوڵەو نەریت و ئارەزووەکانیدا، ئەوا ئەو گلاندە زیاتر هۆرمۆنی نێرینە دەردەدات ، لەئەنجامدا سروشتی ئەو ئافرەتە لەسروشتی پیاو دەچێت ، جا ئەگەر ئافرەت ڕێڕەوی پیاوی گرتە بەر لەبەرگ و پۆشاك و جوڵانەوەکانیدا خۆی بەپیاو شوبهاند، ئەوا هۆرمۆنەکانی نێرینەیی زاڵ دەبێت بەسەر هۆرمۆنەکانی مێینەیدا، ئەو کاتە ئافرەتەکە لەپیاو دەچێت ! ئەمەش گۆڕینی فیترەتەولەدەست دانی سروشتییەکانیەتی و وەك پیاوی لێ دێ کەنەخۆی رازی دەکات و نەپیاوەکەشی ٠بەهەمان شێوەیش گەر پیاو ڕێڕەوی ژنانەی گرتە بەر و خۆی بەوان چوواند لەجل و بەرگ و سەرو سیمادا ، ئەوا تایبەت مەندییەکانی پیاوەتی و هێز لەدەست دەدات ، وەك هەندێ لەو گەنجانەی کەسەرەڕای ڕیشیان سمێڵیشیان پاك دەتاشن و برۆو دەم و چاویان هەڵدەگرن و ملوانکەی ئاڵتون لە مل دەکەن و میکیاج دەکەن و قژی سەریان هەر ڕۆژە لەسەر مۆدیلێ حەفر دەکەن و پانتۆڵی تەسك لەبەر دەکەن، بەشێوەیەك کەلەبازاڕ دەبینرێن تاچاك سەرنج نەدەی نازانی کامیان کوڕەکەیە و کچەکەیە !! جانازانم کامەیە شارستانی و پێشکەوتنەکە ؟ گومان لەوەدا نییە کەجوانی و پاك و خاوێنی لەخواستەکانی مرۆڤەو



ئیسلامیش داکۆکی لەسەر کردووە، بەڵام ئەوەندە گرنگییان داوە بەجوان کردنی ڕوکەشیان، تا ناوە ڕۆکەکەیان فەرامۆش کردووە و هەگبەیان پیس بووە پێچەوانەی ڕووکاری دەرەوەیانە ، ئەم دیاردەیەش بەئاشکرا لەڕۆژئاوا زیاتر دەبینرێ ، کە خۆ چواندنی ئافرەتان بەپیاوان زۆرترە، وازیان لەیەکتر هێناوەو بەشێوەیەکی زۆر ناشرین مەیلیان داوە بەلای (شـــذوذ الجنـــسی)دا، چونکە هەریەکەیان لەڕێڕەوی سروشتی خۆی لای داوە!! جا بەداخەوە کە لەولاتی خۆشمان ئەم دیاردەیە لەزۆر بوندایەو ئاکامەکانیشی مەترسیدارە، چون کوڕانی بەشێوە ئافرەت کۆمەڵگا بەرەو ژیانی ئاژەڵی دەبات  شاعیر دەڵێ :

پێکەنینم دێ و تاس دەمباتەوە ! بەمە لاسایی غەرب دەکاتەوە ؟
پانتۆڵی کورت گۆرەوی نایلۆن قژ تا پشت ملی دایساوی بەڕۆن
سمێڵ بتاشی و لاجانگ چوار پەنجە چۆن پێناکەنم بەو جۆرە گەنجە

## خۆ شوبهێنەری ئافرەتان لەماڵەکانتان دەر بکەن

(ام سَلمَه) دەڵێت پێغەمبەری خوا لام بوو لە ماڵەکەدا کەسێکی خۆشوبهێنەری لێ بوودەڵێ: ئەو خۆشوبهێنەرە بە(عبدالله)ی برامی وتبوو ئەگەر خوای گەورە (تائف)ی ڕزگارکرد بەدەستی ئێوە کچێکت لە (عیلان) پێنیشان دەدەم لە پێشەوە چواری هەیە و لەپاشەوە هەشت پێی هەیە.

واتە (قەڵەوە) ، پێغەمبەر (ص) فەرمووی:( ئەمە بانەیەتە ژوورەوە بۆ لاتان) واتە دەری بکەن، (رواه البخاری) تێکەڵاوی ئەمانە مەترسی دارە و جێگەی گومانە چونکە باسی لەش و لار و شێوەی ئافرەتت بۆ دەکات یان باسی شێوەو لەشی پیاوت بۆ دەکات، وەکەلە ماڵەکەت دەچێتە دەرەوە باسی تۆش دەکات بۆ خەڵکی، دەبێ ئەم جۆرە کەسانە ڕێگرییان لێ بکرێت •

بێگومان ئەوەی کەلە بنەڕەدا هەروایە و نێرەموکە (مُخَنث)ە ئەمەیان هیچی لەسەر نییەو دەبێ هەوڵ بدات بۆ لابردنی ئەو ڕەوشتە خراپەی کەهەیەتی ، بەڵام لێرەدا مەبەست لەو گەنجانەیە کەبە ئەنقەست خۆیان دێننە سەر شێوەی کچ یان بە پێچەوانەوە.

جا بۆ ئەوەی چاکتر بزانی لەتوڕە بوونی پێغەمبەر و هاوەڵانی بۆ ئەم جۆرە کەسانە دەچینە خزمەت ئەم فەرموودەیە ابو هریرە (خ) دەڵێ: (کەسێکی خۆ شوبهێنەریان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (ص) ڕونتر بڵێین پیاوێکی کچانیان هێنایە خزمەتی کەدەست و پێی

بۆیە کردبوو وەك ئافرەت ، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە خۆی وەك ئـافرەت دەچـوێنێ، پێغەمبـەریش نـەفی کـرد بـەدوور خستنەوەی بۆ شوێنێکی چۆڵ بۆ ئەوەی تێکەڵی خەڵك نەبێ، پاشـان پێیـان وت:ئـەی نـایکوژی؟ فـەرمووی: (مۆڵـەتم نـەدراوە نوێژکەران بکوژم ) (رواه ابو داود). ئەم فەرموودەیە بکە بەپێوانەی ئەو کوڕانەی ئیستا نینۆکیان درێـژ دەهێڵنـەوە ، مکیـاج دەکـەن، برۆیـان هەڵـدەگرن، دەموچـاویان دەکـەن، زنجـیری ئاڵتونیـشی بەخاچەوە لە ملدایە کەدووجار حەرامە، سمێڵ و ڕیش هەر نابێ هـەبێ دواکەوتوییە !! سـەرەڕای شێوەی لـەش و لاری کـچانەشی بەرگی تەسكو ئالو والای کچان لەبەر دەکات ...، ئایا چی لـەپیاو ئەچێ ؟ ئەوەیە مۆدێل و مۆدێرن و چاولێکەری کوێرانە ،کەپیاو لەوێنەی ژنانە •

## هه‌ڵبژاردنی هاوڕێ

مـرۆڤ به‌سروشـتی خـۆی كۆمه‌لآیه‌تییـه‌و به‌تـه‌نها نـاژی بـۆ ئـه‌م مه‌به‌سـته ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام به‌رنامـه ڕێـژی بـۆكردوین بـۆ هه‌ڵبـژاردنی هـاوڕێی بـاش ودووركه‌وتنـه‌وه لـه‌هاوڕێی خـراپ، لـه‌م ژیانه‌مانـدا كۆمـه‌ڵێك بانگـه‌وازی ڕێگـه‌ی به‌هه‌شـت ده‌كـه‌ن وخێمـه‌ی سپی ئاشـتی و برایـه‌تی وڕاسـتی وپاكییـان هه‌ڵـداوه، لـه به‌رامبـه‌ر ئه‌مانه‌شدا كۆمه‌ڵێك بانگه‌وازی بۆڕێگه‌ی شـه‌یتان ده‌كـه‌ن بـۆ تـاوان وخراپـه كـاری وبـه‌ره‌ڵلآیی و له‌ڕاگه‌یاندنه‌كانیـشدا پڕوپاگه‌نـده‌ی پێشكه‌وتن وشارستانیشی بۆده‌كه‌ن و زۆر شیرین وجوانی ده‌كـه‌ن !!جـا پێویـسته هه‌مووكـه‌س ڕێگـای خـۆی ئـاوازی خـۆی هـاوڕێی خۆی بناسێ وبزانێ، ئه‌گه‌ر نه‌یزانێ ئه‌وه له‌ڕیزی گێل و نه‌فامانـه با بڕوانامـه‌ی به‌رزیشی ببـێ ، پێغه‌مبـه‌رمان (ﷺ) بۆ ئه‌و مه‌به‌ستـه یاسـاییه‌كی بـۆ دانـاوین كه‌فه‌رموویـه‌تی:( المَـرء علـى دیـنِ خلیلـهِ فلینظراحـدكم مَن یخالل) واتـه: ئینسان له‌سـه‌ر پـه‌یڕه‌و و ڕێبـازی دۆست و خۆشه‌ویسته‌كه‌یه‌تی،جا هه‌ر یه‌كێكتان با سه‌رنج بدات و ورد بێته‌وه و بزانێ له‌گه‌ڵ كێدا دۆستایه‌تی ده‌گرێ.ئه‌مڕۆ هۆكاری گـومڕا كـردن و خـه‌ڵكی خـراپ ئه‌وه‌نـده زۆر بـووه گـه‌ر ده‌سـتت به‌ده‌سـتی خـوا پێـداو وچـاكه‌كارێكه‌وه نـه‌بێ ئـه‌وه ئـه‌دزرێی و ئه‌خورێی بێ ئه‌وه‌ی پێی بزانی، ئیمامی عه‌لی ڕه‌حمه‌تی خوای لێ

بێ لە هۆنراوەیەكی درێژ باسی هاوڕێیەتیمان بۆ دەكات لەیەكێ لەدێڕەكانیدا دەفەرموێ :-

فَلا تصحب اخا الجهل فاياك واياهُ        فكَم مِن جاهلٍ اردى حليما حين اخاهُ

واتـە:نەكـەی ئـەی مرۆڤـی ژیـر، ئـەی گـەنجی جـوان هاوڕێیـەتی خـەڵكی نـەفام و نـەزان بكـەی! چـەند جـار بینـراوە خـەڵكی نـەفام خـەڵكی بـەفامی لەخـشتە بـردووە و لەڕێگـە لای داوە، خراپـە زوو بـڵاو دەبێتـەوە، ئـەوە چـەندجار بینیوتـە جگـەرەكێش هاورێكـەی فێری جگەرە كێشان كردووە، بەڵام كەمتر دەبینی جگـەرە نەكێشێ جگەرە بەهاوڕێكەی تـەرك بكـات، سـندوقێك سـێو یـان تەماتـە یـەك دانەی خراپی تێدا بێ هەموو سندوقەكە خراپ دەكات ، بـەڵام بـەو هەموو سێوە یەك دانەیان پێ چاك ناكرێ.. سوننەتی خوا ئاوایە ، لەبەر ئەوە چارەسەر ئەوەیە كـە دوور بـی لـەهاورێی خـراپ چونكە بەشـێوەیەك خـوو ڕەنگـی هاوڕێكـەی وەردەگـرێ ئامـاژە بـە فەرموودەكـەی سـەرەوە (خلیـل) دۆسـت و خۆشەویـست، خـودا لەقورئانـدا فەرموویـەتی: (الاخـلاء یۆمئـذ بعـضهم لـبعض عـدوالا المـتقین)زخـرف ٦٦واتـە:ئەوانـەی لـەدنیادا بـرادەر وخۆشەویستی یەكتری بوون وبەخراپە كاری ژیانی دنیایان دەبردە سـەر ، ئەوانـە لـەڕۆژی دوایـدا دەبنـە دووژمنـی یـەكتر تـەنها ئـەو كەسـانە نـەبێت كەلـەپێناوی خـودادا یـەكتریان خۆشویـستووە ولەسـەر ڕێبـازی خوابـوونو چـاكە كـاربوون، ئەمانـە ئـەو كـاتیش هـەر دۆسـت وخۆشەویستی یەكترین، جاهەموو مامەڵەیەك هەروایە كە زەرەریان كـرد كێـشەو هـەڵلای لێدەكەوێتـەوە تـەنها تـەقواداران نـەبێ لەبـەر

خودا دۆستایەتی یەکتریان کردووە یەکتریان خۆشویستووە ئەوانە لەژێرسـێبەری عەرشـی خـودادا حەشـردەکرێن، خەلیفـە مـەئمون دەڵێ: دۆست سێ جۆرن

١- هەنـدێکیان وەك و خـواردن پێویـستن نـاکرێ لێیـان دوور بـین، وەکو زانایان و دانایانی خوا ویست و ڕەسەن ٠

٢- هەندێکیان وەکو دەرمان جاروبار پێویستمان پێ دەبن

٣- هەنـدێکیان وەکـو دەردو نەخۆشـی وان ، ئەمانـە هـاوڕێی خراپن، خودا بەدوور تان کات لێیان ٠

## ئەدەبمان لەگەڵ هاوڕێکانماندا :

دیارە بناغەی پەیوەندی و ڕەفتار لەگەڵ دۆستو برادەر بریتییە لەو برایەتییەی کەلەسەر ئیمان بنیات نراوە ، برایـەتی ئیمـان وەك خـوای گـەورە فەرموویـەتی (إنّمـا المؤمنـون إخـوة) دیـارە حـەق و فەرمانـەکانی برایـەتی ئیمـانیش زۆر و جـۆراو جـۆرن ، بـەڵام هـەموویان لـەوەدا کۆدەبنـەوە کەچیت بـۆ خـۆت پـێ خۆشـە بـۆ براکەشت پێت خۆش بێت) وەبە پێچەوانەوە چ شتێك بۆ خۆت پێ ناخۆشـە بـۆ ئەویـشت پـێ نـاخۆش بێـت ، ئـەوەش فـەرموودەی پێغەمبـەرە (لایـؤمن احـدکم حتـی یحـب لاخیـهِ مـا یحـب لنفسـهِ) . متفق علیه .

جا پێویستە ئەدەبمان لەگەڵیاندا لەسەر بنەمای ڕەوشتە جوانەكان بێ كەنیشانەی ئیمانی تەواوە ، لەوانە :

١- بەلام كردن و ڕووی خۆش و ڕێز لێگرتنیان لەكاتی بەیەكگەیشتندا و بەخۆشترین ناو بانگیان بكەین •

٢- ناووناتۆرە و تانە و تەشەرەیان لێ نەدەین •

٣- وەكو برایەكی ئیمانی سەیریان دەكەین و كەم و كوڕییەكانیان دەشارینەوە و باسیان ناكەین •

٤- هەركاتێ نەخۆش كەوتن سەردانیان دەكەین و دوعای خێریان بۆ دەكەین .

٥-لەپاشە ملە بەخراپ باسیان ناكەین و غەیبەتیان ناكەین .

٦-چیمان بۆ خۆمان پێ خۆش بێت ئەبێ بۆ ئەوانیش پێمان خۆش بێت .

٧-اتێ چاكەیان لەگەڵ كردین وەفادار بین و سوپاسیان بكەین .

٨-هاندەریان بین بۆ چاكەكاری و ڕێگری بكەین لەو كارە خراپانەی كەدەیكەن .

٩-بەئامۆژگاری برایانەو لێككەیشتن ناكۆكی و جیاوازییەكان یەكلایی بكەیتەوە و شەرع بكەین بەحاكم.

شایەنی باسە حەسوودی پیسترین نەخۆشییە كە تووشی درەختی برایەتی دێت و كرمۆڵی دەكات ، حەسوودییە درۆ و خیانەت و خراپەكاری لەنێوان دۆستان و براياندا دروست دەكات پێویستە هەوڵ بدەین بۆ دوور كەوتنەوەمان لەحەسوودی.

## کاریگەری هاوڕێیەتی

بێگومان هاوڕێیەتی کاریگەری ڕاستەو خۆی هەیە لەسەر هاوڕێکەی بەچاك یا بەخراپ، جا دۆستایەتی خاسان وخوا ناسان سەربەرزی دنیا و دواڕۆژە ، لەدنیادا خیانەتت لێ ناکات و بەرەو چاکەت دەبات و دەبیتە مرۆڤێکی بەکەڵك .وەلە ڕۆژی قیامەتیش بەرهەمی ئەو برایەتییە ئیمانییە ڕزامەندی خوداو بەهەشتی بەرینە، وەهاوڕێی خراپ بەلای دنیاو دوا ڕۆژە ، لەدنیادا ڕەفیقی خراپ فێری جگەرە و ئارەق و قومار و داوێن پیسی و بێ حەیایی و خیانەت کردن و سەرجەم شتە خراپەکانت دەکات و پاشان ماڵ وێرانی قیامەت پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لەو بارەیەوە فەرموویەتی:(إنما مثل جليس الصالح و جليس السؤ كحامل المسك ونافخ الكير ...) متفق عليه .

واتە: وێنەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ وەك عەتر فرۆش و کوورەچی وان، عەتر فرۆش گەر لێشی نەکڕی بۆنی خۆشت بۆ دێ و زیانت لێ نادا، بەڵام گەر لای کوورەچی و ئاسنگەر بی پریشکی ئاگر و دوکەڵت بۆدێ ، هەرکەس نزیکی کوورە دانیشێ یا پریشك لێی ئەدا یا سەری دێشێ واتە: هاوڕێی گەمژەو گێل مەکە خەم و خەفەتت بۆ دێتە پێشێ، سەرنج بدە لەکۆمەڵەی خۆر کە وەکوو مانگ تاریکن بەڵام بەهۆی

هاوڕێیـــەتی کردنـــی خـــۆر بونەتـــە تیـــشك دەرەوەو ســـود بەخۆشـیانو خـەڵکیش دەگەیـەنن، شـێخی سـەعدی دەڵـێ: دۆسـتی خـراپ لـەمار خـراپترە چـونکە مـار کەپێیـەوە دای ماوەیەکە و چاك دەبییەوە یان تەنها زیانی دنیاییت لیّ دەدات، بـەڵام دۆسـتی بـەد وخـراپ دووچاری زەرەری دنیـاو دواڕۆژت دەکات ،چون لەدنیادا خراپی چاندووە و هەر خراپە ئەچنێتەوە ، جاکـەوابێ دوو جـۆر ڕەفیـق هەیـە، ڕەفیقـی چـاك ئەوەیـە کەبەتەقوایـە ، ڕەفیقـی خـراپیش ئەوەیـە کـە بەڕەڵاّیـە ، جـا فەرموودەکـــەش دەفـــەرمووێ ئینـــسان لەســـەر دینـــی ڕەفیقەکەیەتی، واتە ئەگەر هاوڕێکەت کە دیندارو چاکەکار بوو ئەوا کاریگەری لەسەر تۆ دەبێت و تۆش چاك دەبی، وەئەگەر هاوڕێی لاروخوارت گرت ئەوە تۆش وەك ئەو لاروخوار و ماڵ وێران ئەبی وبەخۆشت نازانی چۆن سەرگەردان ئەبی ، ئەو منالاّنـەی کـە تێکـەڵی سـەیرانگاکان و ڕەش بەڵـەك و مـەی خـۆرەوان دەبـن سـەرەنجام چـی لـێ دەردەچـێ ، وەك مـارو دووپشك و ئەبێتە نەگبەتی بۆ ماڵ و کەس و کاری و پاشان بۆ گەلەکەی ئەبێتـە ڤایرۆس و میکرۆب ئەبێتـە ئایـدز بـۆ کوڕو کچەکانمان ، تەنانەت لەقوتابخانەو زانکۆکانیشدا کە مەڵبەندی پـەروەردە و فێرکردنـە، ئیستا دووچاری کێشەو گرفتـی زۆر بـوون بەتایبـەتی لەگـەڵ مامۆسـتاکانیدا چـونکە فێرکردنەکـە پەروەردەی لەگەڵدا نییە و تەنها بۆ بڕوانامەیە بەبێ پـەروەردەو



کارپێ کردن، جائەگەر موسوڵمانان فریای کچ و کوڕەکانیان نەکەون ئەوا منداڵەکانیان دەدزرێن و بەئاڕاستەیەکی خراپدا دەبرێن بەهۆی دەورووبەری خراپەوە ، بەهۆی ڕاگەیاندنی چەواشەوە ، بەهۆی دوورخستنەوەی شەریعەت لەژیانی ڕۆژانەمانەوە. پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر و پرسیاری قیامەتی لێکرد و ئەویش وتی چیت بۆ ئامادەکردووە کابراش وتی وەڵڵاهی تاعەتی زیادم نییەو کردەوەی چاکم کەمە بەڵام خواو پێغەمبەرم خۆشدەوێ پێغەمبەریش فەرمووی ((الَمرءُ مَع من احب))واتە ئینسان لەگەڵ ئەوکەسەی حسابی بۆ دەکرێ کە خۆشی دەوێ، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە(تُحشرمعَ من احبَبت)واتە کێت خۆش بوێ لەگەڵ ئەو حەشردەکرێی، جا خۆشەویستی خاسان و خواناسان دەستکەوتە ، چاکترین دەستکەوتە ،چاکترین سەرمایەیە کەخەڵکی هەوڵی بۆ نادەن بەداخەوە،گەر چاکەشت نییە پیاوی چاکت خۆش بوێ چاکەیە، گەر خۆت مەرد نەبوی ڕێز لەپیاوی مەرد بگرە، ئەگەر خۆت نوورنەبوی ڕێز لەنوور و نوورانییەکان بگرە وڕێز لەخوا پەرستان بگرە ئەوە هەمووی شەرم و حەیایەو ڕۆژێك فریامان دەکەوێت و بەرەو لای خوا ئەمان گێڕێتەوە ، جا خۆشەویستانم زۆر گرنگە مرۆڤی چاکتان خۆش بووێ ئەوە بۆخۆی بەشێکە لەدین و کە (ولاء)ی پێ دەڵێن جا خۆشویستنی شتە چاکەکان بەرەو چاکەت دەبات وئەنجامی



چاکیــشی لێدەکەوێتــەوە، چــونکە کــەتۆ کەســێکی باشــت خۆشویــست بەگوێــشی ئەکــەی (إن المحــبَ لمــن يحــب مطيــع) خۆشەویست بەقسەی خۆشەویستەکەی دەکات، بەپێچەوانەی ئەویش هۆگری وتێکەڵاوی خراپکاران فێری خراپەت ئەکەن، زۆر خەڵکی چاك وپاك لەگەڵ هاورێی خراپ دانیشتووە پێیان وتووە کوڕە دەپێکێ هەڵدەو بخۆرەوە پارەکەت لەسەر من یان لەبەر دڵی من ئەم جگەرەیە بکێشەو یان شاهێدیم بۆ بدە ئەو وردە وردە هـیچ نییـە خـۆ بـەگوڵێ بـەهار نایـە تـا سـەرئەنجام ئەکەوێتـە نـاو خراپـە و تاوانـەوە، ئـاگرێکی گـەورە لـە دەنکـە شـقارتەیەکەوە دادەگیرسـێ و وڵاتێـك دەسـوتێنێ جـا کەواتـە ئەگەر پیاوی خراپت خۆش ویست بەقسەی ئەکەی و پاشان بەئاگری ئەو ئەسوتێی و لەدوا ڕۆژدا لەگەڵ ئەو حەشر دەکرێی ، لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) هانمان دەدات بە هاورێیـەتی کردنـی ئیمـان داران کـە فەرموویـەتی:(لا تـصاحب إلآ مؤمنـا ولا يأكــل طعامــك الا تقــي..) واتـە هەمیـشە ڕەفاقـەتی ئینـسانی موسوڵمان و خاوەن باوەڕ بکە، وەبا پیاو چاك و لـەخوا تـرس نانت بخوات،چونکە بێگومان دۆستایەتی کردنـی خـواو ناسـان لــەخوات نزیــك دەکاتــەوە ولەخراپــە وخراپــەکاری دورت دەخاتەوە:

| | |
|---|---|
| ڕەفیقی چاکان وەك عەتر فرۆشێ | دڵت خۆش ئەکاو زیاد ئەکا هۆشێ |
| ڕەفیقی زانا تۆش ئەکا زانا | زانا ئەوەیە بۆ وڵات تێکۆشێ |



خـوای گـەورە ڕێنموێنمـان بکـات بـۆ هاوڕێیـەتی و دۆسـتایەتی چاکەکاران .

وەلە دوا ڕۆژیشدا لە خزمەت پێغەمبەران و زانایان و پیاوچاکان و شەهیدان حەشرمان بکات - وَحسن أولئك رفيقاً.

## گوڵبژێرێك لە باخ و بێستان
## دیارییە بۆ هاوڕێ و دۆستان

-ئەو کەسەی هاوڕێیەتی کەسانی نزم بکات نزم دەبێتەوە .

-هاوڕێیەتی نەفامەکان ، ماندوو بوونە .

-تەنیایی لە هاوڕێی خراپ چاکترە .

گـا لەگـەڵ گـا بـێ، ڕەنگـی نـاگرێ، بـەڵام خـووی دەگـرێ (پێشینان) .

شارەزا خۆشە هاوڕێی سەفەربێ دووژمنت دانا نەك دۆستت کەر بێ .

-یەکێك لەپیاو چاکان دەڵێ : دڵ کەسەرچاوەی ژیانە پێنج شتە بۆی شیفا و دەرمانە :

(قورئـان خوێنـدن بە تێگەیشتنەوە ، ورگـی خـاڵی ، شـەو نوێـژ، پاڕانەوە و لاڵانەوەی بەیانیان ، دانیشتن لە کۆڕی پیاو چاکان )

-پرسـیار کـرا لـە زانایـەك ، چ شـتێك زۆر باشـە خـوا بیداتـە بەندەکەی؟



وتی : عەقڵ ، چونکە بەهۆی عەقڵەوە ڕێگەی دین و دنیا دەزانی .

وتیان : ئەی ئەگەر عەقڵی نەبوو ؟ وتی : ماڵ و سامان ، چونکە دەوڵمەندی عەیب پۆشە .

وتیان : ئەی ئەگەر ماڵیشی نەبوو ؟ وتی : خزم و دۆستی چاك ، چونکە دۆستی چاك ناهێڵێت تووشی زیان ببێ ، وتی : ئەگەر خزم و دۆستیشی نەبوو ؟ وتی مردنێکی کتوپڕ !

پێێنج توێشوی پێویست......بۆ گەنجانی خوا ویست

- کوڕەکەی لوقمانی دانا پرسیاری لەباوکی کرد ، ئەی باوکە چ شتێ زۆر چاکە بۆ مرۆڤ ؟

- باوك : دین

- کوڕ: ئەی دوو شتی زۆر چاك و پێویست ؟

- باوك : دین و ماڵ.

- کوڕ : ئەی سێ شتی زۆر چاك ؟

- باوك : دین، ماڵو سامان ، شەرم.

کوڕ : ئەی ئەگەر چوار شت بێ ؟

باوك : دین و ماڵ و حەیا و ڕەوشتی جوان !

کوڕ : پێنج سیفەتی چاك و پێویست چین ؟

باوك :دین،ماڵ، حەیا ، ڕەوشتی جوان ، بەخشندەیی (سەخاوەت)

کوڕ : ئەی ئەگەر بوو بەشەش سیفەت کامانەن ؟



باوك : ئەی کوڕی خۆشەویستم ، هەر کەسێ ئەو پێنج سیفەتەی تێدا بێ ، بەسییەتی و شەشەمی ناوێ ، خاوەنی ئەو پێنج شتە چاکە (دین و ماڵ و حەیا و ڕەوشت و سەخاوەت) پیاوی چاکە، ئافرەتی چاکە گەنجی تەقوادارە ، ئەوانە دۆستی خودان و لەسەر ڕێگەی هیدایەت.

## ڕەنگدانەوەی بێکاری لەسەرگەنجان

## بەتاڵە...سەرەنجامەکەی.. تاڵە

دەست بەتاڵی.. کات بەتاڵی..هێلانەی وەسواسە..یاخی بوونە، چینی یەکان(بەتاڵە) یان بەماڵی شێت داناوە، د.ئەمیراڵ (براید) لەکتێبەکەیدا کەناوی (وەحیدا)یە دەڵێ: ڕۆژانی بەتاڵی تاریکە وەك، شەو بەتاڵە ئاگری ئاشوبوو پروپاگەندە خۆشتردەکات بیروباوەڕی خراپ دێنێتەئاراوە، بۆیە مانای ژیان لەدەست دەدات ونرخی کات وزەمان بەفیڕۆ ئەڕوات، جاکەواتە بەچەقۆی کار ملی بێکاری سەربڕە، خۆژیان تەنها بریتی نیە لەماددەوبەس وەك هەندێ لەکۆڤاروڕێکخراوەکان بانگەشەی بۆدەکەن ،دەی باکاتی بێکاری وەك هەلێك بقۆزینەوەوتیایدا لایەنی ڕۆحی ودەروونی خۆمان تێربکەین وبەکاری چاکەوە سەرقاڵی بکەین وەك خوێندنەوە وسەردان وپەیوەندی خزمایەتیو هاوکاری یەکتری و بەجێهێنانی بواری بەندایەتی وکۆمەڵایەتی، وەك لەفەرموودەی پێشەواکەمان دا کەئەمەی کورتە واتاکەیەتی



وفەرموویەتی:(دوونیعمەت هەن زۆرێك لەخەڵكی لێیان بێئاگان ئەوانیش نیعمەتی تەندروستی وبێكاری)یە،چون ئەگەرتۆنەفست سەرقاڵ نەكەی بەشتێكی چاكەوە ئەو تۆ سەرقاڵ دەكات بەخراپەوە، بێگومان بەتاڵە خەمێكەو هەژاری وهەندێ گرفتی بەدواوەیەو ئومێدی چارەسەركرانی هەیە، بەڵام خەمی گەورە ئەوەیەكە مرۆۆ بەو هۆیەوە خۆی بدۆڕێنێ، كەواتە بەخۆدا چونەوەو خۆپێگەیاندن چاكترین دەسكەوتەلەكاتی بێكاریدا، بەپێی ئاماری وەزارەتی كاروكاروباری كۆمەڵایەتی عێراق زیاتر لەملیۆن و نیوێك بێكارناویان تۆماركراوە بێگومان ئەوەندەی تریش هەن كەتۆمارنەكراون، وەبەپێ ی ئامارەكانی وەزارەتی پلاندانان بێكاری لەزیادبووندایە چونكە گرفتی كشتوكاڵ زیاد دەكاو گوندەكان چۆڵدەبن و بەوەش بێكاری پەرەدەسێنێ وپشكی شێریش لەبێكاران توێژی گەنجانە، كاتێ گەنج بێكار دەبێت ناچاردەبێت بۆدەربازبوون بیربكاتەوە بیروخەیاڵی خراپ، كەسەرەنجام گەنجان بەهۆی بێزاری ونائومێدیان دڵسۆزیان بۆنیشتمان كەم دەبێت وئەم دۆخە كاردەكاتە سەردەرروونی گەنج ودەیكاتە مرۆڤێكی ڕەشبین و نائومێد پاشان دووچاری خەمۆكی و لادانی كۆمەڵایەتی وئەخلاقی دەبێت وەك دەبینین زۆرێك لەوگەنجانەی ئالوودە بوون بەخواردنەوە كحولیەكان دواجار بۆدابینكردنی ئەومادانە پەنا دەبەنە بەركاری دزین ومرۆۆ كوشتن بۆپەیداكردنی بڕێك پارە، بەڵگەش ئەوەیە كەزۆربەی گەنجانی



ناوگرتووخانەکان ئەوانەن کەبەوتاوانانە گیراون ئەمەش کۆمەڵگە دووچاری گرفت وقەیرانی گەورەدەکات بۆیە ئەرکی حکومەتە هەوڵبدات بۆدۆزینەوەی هەلی کار تا گەنج ببێتە کەسێکی بەسوودو کاراو خاوەن ئاییندەیەکی گەش،چونکە لەدەستدانی گەنج لەدەستدانی پاشەڕۆژە.

## دورکەوتنەوە لە جگەرە کێشان

جێگەی سەر سوڕمانە لە لوتکەی شارستانیەتی و پێشکەوتندا زۆر گرنگی دەدرێ بەبەرهەم هێنانی جگەرە و بڵاوکردنەوەی لەپێناوی بازرگانی پێکردنیدا ، لەمەش سەیرتر کە بەدەمی گەنجە ڕۆشنبیرو مامۆستاو پزیشکەکانەوە دەبینرێ ! بێگومان هەندێکیان بەهۆی هاوڕێی جگەرە کێش فێربوون هەندێکیشیان بەهۆی چاولێکەری یان بۆ خۆ دەرخستن، هەرزەکاران ئەم دیاردەیە بەهەست کردن بە پیاوەتی دادەنێن، وادەزانێ مافی خۆیەتی ئەو شتانە مومارەسە بکات کە پیاوانی تر ئەنجامی دەدەن ئەوەندە بەسە بۆ خاوەن عەقڵەکان کە ئایەتی قورئان دەفەرمووێت (يحل لهم الطيبات ويحرم عليهم الخبائث) الاعراف ١٥٧ خوای گەورە خواردن وخواردنەوەی کردووە بەدوو بەشەوە وسێ هەمی نییە یان پاکەو حەڵاڵە یان پیسەوحەرامە،جاچ عەقڵێ جگەرە بە چاك و پاك دەزانێ؟سەرباری بۆنی ناخۆش ومەسرەفی زۆروزیانی زۆری تەندروستی وماددی،جگەرە کێشان لە هەموو

كەس ناشرینە،بەڵام لە گەنج و خوێندەوارەكان ناشرینترە!(حوكمی جگەرە كێشان لەناو زانایاندا ڕا جیایی لەسەرە لەنێوان (مەكروە، حەرام)دا بەڵام كەسیان بەچاكیان نەزانیوە) بۆ زیاتر بەئاگابوون و دڵنیابوون لەحەرامی جگەرە سەیری كتێبی (التدخين...اضراره و تحريمه في القران)ی دكتۆر مستەفا زەلمی بكە كە لە(٢٠٠٩) چاپكراوە.

## لەزیانەكانی تەلەفزیۆن خۆت بپارێزە

ماڵەكانی ئەمڕۆ بێ تەلەفزیۆن نییە، ئەم ئامێرە ئەگەر بەدەست بڕوادارانی ڕاستەقینەوە بێ سود بەخشە و بەشێكە لە پێشكەوتن بەڵام ڕادیۆو تەلەفزیۆنی ئەم سەردەمە قورئان گوتەنی(اثمهما اكبر من نفعهما) زەرەریان زیاترە لەقازانج ، تەماشا كردنی فیلمەكان وگوێگرتن لە زۆربەی گۆرانییەكان حوكمەكەیان لەكات بە فیڕۆدان تێپەڕ دەكات بەرەو حەرام چونكە(كل ما يجرَ الى الحرام حرام )، بەهۆی درەنگ خەوتنی شەوان بەرامبەر بەتەلەفزیۆن زیان لەعیبادەتمان دەدات و لەمزگەوت دوورمان دەخات ، لەڕوانگەی خووڕەوشتەوە زیانی زۆری هەیە بەهۆی تەماشا كردنی شێوەی جوانی ئافرەت وپیاوجوڵاندنی ئارەزووەكانیان و ڕاكێشانیان بۆ بەدڕەوشتی و خراپەكاری، لەڕوانگەی كۆمەڵایەتییەوە خەریكە شیرازەی كۆمەڵ هەڵبوەشێنێ بە بڵاوكردنەوەی فیلمی خراپ و ڕووت كردنەوەی ئافرەت و نەمانی شەرم و حەیا و بانگەواز كردن

بۆ لێکچوونی پیاوان و ئافرەتان ...، هەتا شتێکی باش نیشان ئەدەن لە پاڵیدا دەیان شتی خراپ بڵاودەکەنەوە پێویست بوو ڕاگەیاندنەکان لەخزمەتی جەماوەردا بن و ڕاستییەکان بڵاو بکەنەوە و خاڵە ئیجابی وسلبییەکان دیاری بکەن ، بەڵام زیاتر بۆ مەبەستی پڕوپاگەندە وچەواشەکاری بەکاریدەهێنن و لەخزمەتی دەسەڵاتدارەکان دایە و ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆی لەدەست داوە! تیڤییەکانی ئەمڕۆمان لەشێوەی حەبی بێ هۆشکەردان کە بێ ئاگامان دەکەن لەڕاستییە کانی ژیان، پێویستە خۆمان بپارێزین لەزیانەکانی T.v کە:مێشك وچاومان ماندوودەکات، زیاتر تەمەن بە فیڕۆ دەدات وکات بە زایە دانە، بەوە زیان لە دین ودنیامان دەدات و تەلەفزیۆن دەبێتە (تەلەفی دین) تەنها بەئەندازەی پێویست لێی بچنە پێش بۆ ئاگادار بوون لە هەواڵی دنیاو بابەتە زانستییەکان ......

## یاری تۆپی پێ ..........یان ؟

گومان لەوەدا نییە کە وەرزش بە هەموو جۆرەکانییەوە پێویستە و سوود بەخشە، بۆ تەندروستی لاشە، بەمەرجێ تێکەڵی وڕووتی ئافرەتانی تێدا نەبێ، وەلەسنوور دەر نەچێ ، وەرزش و یاری بێت نەك ببێتە بیرو باوەڕو دەمار گیری و ئامانجی ژیان !لەیەکێك لەیاریگاکانی بەریتانیا جەماوەری هەردوو تیپی یارییەکە بەشەڕهاتن وبەدەیان کەس کوژران و بەسەدان کەسیش بریندار



بوون تا پۆلیس دۆزەكەی كۆنترۆڵ كرد! ئەمە سەیرنەبێت بەلاتەوە چـــونكەیاری سیاســـی پارەوراگەیاندنـــەو بووەتـــە ئامـــانج و بیروباوەڕیـان و تـەنها ژیـانی دنیایـان مەبەسـتە وبڕوایـان بـەڕۆژی دوایـی نییـە .بـەلام ئـەوەی جێگـەی داخ و سەرسـوڕمانە كەئـەم دەمارگیرییە بۆ تۆپی پێ لەناو موسوڵمانانیشدا پەرەی سەندووە ، یەكێك لەو یاریزانانە بۆی گێڕامەوە كەبڕیار درا تیپی فلان وفلان لەیارییەكی(دۆستانە)دا بەیەك بگەن، وتی سەیرم كرد لەكاتی خۆ ئامـادە كردنەكـەدا دارو قامـچی شـەڕكردن لـەناو سـەیارەكەماندا ئامادە كرابوو وەك پێداویستییەكی یاری ، ئیتر لە كۆتـایی یارییـە دۆستانەكەدا بو بە لێدان و شەڕ و هەرا !!لەمانگی یانزەی(٢٠٠٩) هەردووهەڵبـژاردەی میـصرو جـەزائیر لەخـەرتوم بەیەككەیـشتن بۆكاسی ئەفرقیا، دواتر بوو بەگرفت وكێشەیەكی گەورە بۆهەردوو ولاتـــی بـــرا! تاگەیـــشتەئەوەی كەپەیوەندیـــە دبلۆماســـیەكانیان پـچڕاندو مـاوەكی زۆر سـەرقاڵی كـردن، تـا لیبیـا كەوتـە ناوبـژی! لەوەش سەیرتر لەنێوان قوتابیانی زانكۆ پەیمانگاكاندا كە لوتكەی زانستین باس باسی مەدالیای ئاڵتونی و كاسی زیوە، بە شێوەیەك زیادە ڕۆیی تیادا كراوە كە سنووری خۆی بەزاندووە، نـازانم چۆن دەبوونـە جمهوری لایـەك و هـەرایان بـۆ دەكـرد ، لەكاتێكدا ئێمـەی كـورد دەوڵـەتمان نـەبووە تـاكو لەگـەڵ یـاریزانی ولاتێكـی تـر یـاری بكەین و خۆشحاڵ ببین .یەكێك لـەو شـتە سەرسوڕهێنەرانەی كەلـە ولاتی خۆمان ڕوویدا وجێگەی پێكەنین و گریانە! ژن ومێردێك هەر



یەکەیان لایەنگری تیپێك بوون لەکاتی سەیرکردنی یارییەکدا، لەگەڵ سەرکەوتنی ئەو تیپەی کە پیاوەکە لایەنگریەتی وەکو ئەوان هاواری کردو شەقێکی لەژنەکەی هەڵدا وتی گۆڵ !پاشان بەو هۆیەوە ژنەکەی تەلاق دراوماڵەکەیان تێك چوو !جائەمە یاری تۆپی پێیە یان یان شەڕی ناوخۆیە یان بەفیڕۆدانی تەمەنی جوانی تۆیە ؟! بەداخەوە کەهەندێ لە گەنجەکانمان گیرۆدەی دەردی ئەم یارییە بوون وکاتێکی زۆر لەتەمەنیان بەزایە دەدەن بێ ئەوەی خۆیان لەناو یارییەکەدا بن، کۆتایی ئەم باسە بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) دێنن کە تیایدا ئاماژە بەچەند یارییەك دەکات کە بەسوودن بۆ بەهێزکردن وساغ ڕاگرتنی لاشەو ئامادەکردنی بۆکاتی ڕوبەڕو بونەوەی ناحەزانی ئیسلام، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە بەکوردی:(هەرشتێك کەپەیوەندی بەیادی خواوە نەبێت پوچ وبەتاڵەو جگە لەچوار شت:

١- تیر ئەندازە ونیشانە داکردن.

٢- ڕاهێنان بۆ ئەسپ سواری .

٣- یاری ودەست بازی لەگەڵ هاوسەردا .

٤- فێرکردنی مەلەوانی (تەبەرانی) گێڕاوییەتەوە، کەواتە ئەگەر زیادەڕۆیی تێدا نەکرێ ئەم یارییانە چاکن

٥- (سوارچاکی ، نیشانە داگرتن ، تۆپ تۆپێن ، زۆرانبازی، ڕاکردن ، بازبازێن ، مەلەوانی ..........هتد

## ڕۆیشتن بۆ هەندەران

چوون بۆ هەندەران لەوەدا نەماوە کە پاساوی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ بێننەوە ، بەڵکوو زیاتر چاولێکەرییە و هیچ بیانویەك ناخوازێت ، بۆ ئەوەی لەڕەفیقەکانی جێ نەمێنێت و خۆی لەوان بەکەمتر نەزانێ ، موڵك و ماڵی ئەفرۆشێ و ڕێگەی قاچاغ و هات و نەهات ئەگرێتە بەر کە ئەوپەڕی زەلیلییە ، جا کەگەیشتە (ئەورووپا یان ئەمریکا) بۆ وەرگرتنی ئیقامە دەیان درۆ هەڵدەبەستێت ، ئەوەی لێرە زۆر دەوڵەمەندە لەوێ دەبێتە ئەو منداڵە ئەفریقییەی کە قەل و داڵ چاوەڕێی خواردنی تەرمەکەی دەکات ! تا گۆڵی خۆی دەکات جا کە مافی پەنابەرێتی و مانەوەی وەرگرت ئیتر لە (کاکە) وە دەبێت بە (مستەر) ، تووك بەبەر سمێڵ و ڕیشیەوە نامێنێ و فوول ئەورووپی ......! دیارە حساب بۆ زۆرینە دەکرێ گەرنا هەندێکیشیان بیانوی شەرعیان هەیە و دینی خۆشیان پاراستوە، بەڵام دیاردەکە مەترسیدارە ئەوەتا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) بەرائەتی خۆی دەربڕیوە لەو موسوڵمانەی کەلەناو موشریك و کافراندا دابنیشێ و ژیان بباتە سەر وەك دەفەرموێ : ((انا برئ ومن کل مسلم یقیم بین أظهر المشرکین)) (رواه ابو داودو النسائی) ئەمەش لەبەر سێ هۆ موسوڵمان دروست نییە لەناو کافراندا بژیت :

ئـەو موسـوڵمانە دینـداری بـۆ ناکرێـت وەکـو پێویـست ، لەبـەر ڕێگەنەدانی یاسای ئەو وڵاتە، لەوانەیە بڵێـی لـەوێ ئازادییە کەس ڕێگـری لـە نوێـژ ناکـات ، بـەڵام خـۆ ئیـسلام تـەنها نوێـژ نییـە و پاشـانیش ئـەوەتا لەشـوێنێکی وەك فەڕەنـسا کـە دایکـی دیموکراسـیەتە بـەڵام حیجـاب قەدەغـەکرا چـونکە نیـشانەی ئافرەتـانی موسـوڵمانە دەی چـۆن ئـەتوانێ بخوێنـێ ئـەو کەسـە لەوڵاتی خۆیدا دەتوانێ دینداری بکات (هەرچەندە لێرەش گرفتی بۆدروست دەکرێ بەڵام زۆر باشترە لـە شوێنانی تـر چونکە وڵاتـی ئیسلامە،جا ئەگەربڕوانامەیەکیشی ببێت با خزمەتی وڵاتـی خـۆی پـێ بکـات نـەك وڵاتـی بێگانـە.. موسـوڵمانان پەرشـو بـڵاو نەبنـەوە بـەوڵاتانی کافرانـدا لەبـەر ئـەوەی نەلـەوێ شـتێکی ئـەوتۆیان پـێ دەکـرێ بـۆ ئیـسلام، وڵاتـی خۆشمـان چـۆڵ دەبێـت لـە گـەنج و لاوەکانمان کە پیاوی دواڕۆژی ئەم وڵاتەن ، پێشینانیش وتویانە :

بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە     گەر لەوێ نەما بڕۆ بیبینە
مەبەست ئەوانەن کە لێرەنینە     لای مرۆڤی مەرد وەتەن شیرینە

## حوکمی ڕۆیشتن بۆ هەندەران :

کەسێك بۆ خوێندن بڕوات و ئەو خوێندنە لەولاتەکەی خۆی نەبێت و ولاتەکەشی پێویستی بێت وەك خوێندنی پزیشکی ، دروستە بەمەرجێ ئیمانەکەی لەدەست نەدات ئەگەر بۆ مەبەستی خزمەتکردن و بەرژەوەندی ئیسلام بڕوات (کەئەمەیان زۆر کەمە) دروستە وەك کۆچ کردنی صەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە فەرمانی بەڕێزیان بۆ حەبەشە و مەدینە کە ئەوکات بێ باوەڕ بوون، (حەبەشە) گاور بوون وەك ئەورووپای ئەمڕۆ ، خەڵکی مەدینەش تێکەڵە بوولە بت پەرست و جولەکە .....

ئەو کەسەی بەمەبەستی ژیان و پارە پێکەوەنان بڕوات (کە ئەمەیان زۆرینەیە)، ئەوە دروست نییە بڕوات مەگەر ئەو شوێنەی بۆی دەچێت خەڵکی موسوڵمانی لێبێت و لەگەڵ ئەوان بژی بەچاکی ئیسلامەتی و دینداریان بۆ بکرێت ئەمەش کەمە (ابن تیمیە) فەرموویەتی : (ئەم کارە نەکەی باشترە چونکە خراپەکەی زیاترە لەچاکەکەی) ، دینداریيەکە چاکترەو لەپێشترە لە دینار و دۆلار .

جگە لەمانەی باسمان کرد حاڵەتی ناچاریشمان هەیە وەك چارەسەری نەخۆشی ، یان بازرگانییەك کەبە خۆی نەبێ نەکرێ و هەر شتێکی تر کە ناچاری بێت دروستە . والله أعلم بالصواب

## به‌سه‌رهاتی گه‌نجێك له‌ڕێگه‌ی ئه‌ورووپا:

ئه‌م باسه‌ چه‌ند ناونیشانێك هه‌ڵده‌گرێت له‌وانه‌ (دینی خوا بپارێزه‌ پارێزراوی، یان ئه‌وه‌ی به‌چاوی خۆم بینیم) ئه‌م بابه‌ته‌ دروست کراوو هه‌ڵبه‌ستراو نییه‌ ڕووداوێکی واقیعییه‌ وله‌ڕێبواری ئه‌و ڕێگایه‌ ((ئه‌یوب عه‌لی به‌گی قامیشی)م وه‌رگرتووه‌ که‌ئه‌مه‌ کورته‌ی باسه‌که‌یه‌: ساڵی (٢٠٠٢) بڕیارمدا له‌به‌رخوا براژنه‌که‌م ومناڵه‌کانی بگه‌یه‌نمه‌ براکه‌م له‌به‌ریتانیا و بگه‌ڕێمه‌وه‌، قاچاخچییه‌که‌ کوڕێکی ئێرانی بوو ئێمه‌ پێنج که‌س بووین ، که‌گه‌یشتینه‌ (برۆکسل) پایته‌ختی به‌لجیکا پێش نیوه‌ڕۆ بوو قاچاخچییه‌که‌ وتی ده‌بێ تائێواره‌ بچنه‌ ئه‌و (باڕه‌) له‌وێ شتێ بخۆن و کات به‌سه‌ر به‌رن و پاره‌که‌شم بۆ داون ، چونکه‌ بێنه‌ ده‌ره‌وه‌ پۆلیس ده‌تانگرێ چونکه‌ لێره‌ سه‌ر ڕه‌ش دیار و نامۆن، شه‌و دێمه‌وه‌ به‌ڕێتان ده‌که‌م بۆ فه‌ڕه‌نسا وپاشان بۆ به‌ڕیتانیا، به‌ڵام کاك ئه‌یوب ئه‌ڵێ زۆر هه‌وڵیان دا له‌گه‌ڵ من که‌بچمه‌ نادیه‌که‌ من له‌به‌ر خوا ڕازی نه‌بووم بچمه‌ ناو باڕه‌که‌، ده‌لیله‌که‌مان وتی ئه‌وه‌ چه‌ند ساڵه‌ کارمه‌و وه‌جبه‌م لێره‌ داناوه‌ و هه‌رکه‌س له‌بازاڕ بوبێ (پاقله‌)واته‌ پۆلیس گرتوویه‌تی وه‌که‌سیشم نه‌بردۆته‌ماڵی خۆمان، به‌ڵێ چوار که‌سه‌که‌ چوونه‌ مه‌یخانه‌که‌ تاکو سه‌لامه‌ت بن منیش له‌و سه‌ر شه‌قامه‌ ده‌گه‌ڕام، به‌ڵام کاری خواو عه‌قڵی عه‌بدان لێك دووره‌، کاره‌که‌ پێچه‌وانه‌ ده‌رچوو دوای ماوه‌یه‌ك پۆلیس خۆیان

کرد بەناوبازەکەدا و ئەوانیان گرت و بردنیان، ئێوارە قاچاخچیەکە هاتەوە وبینی تەنها من ماوم و ئەوان گیراون !زۆر سەری سوڕما کە تاکو ئێستا نەفەرێ لەو شوێنە نەگیراوە ئەمە یەکەم جارە !چۆن ئەوان دڵنیا بوون کەهەر کەسێ ئاوا لەبازاڕ بوبێ گیراوە ، ئیتر وتی تۆ لەگەڵ بیروباوەڕەکەت ڕاستت کردووە بۆیە خوا تۆی پاراستووە، وەرن دەتان بەمەوە ماڵەوە چونکە منیش متمانەم پێتانە بردنیەوە ماڵەوە و بە جوانترین شێوە خزمەتی کردین و بەڕێی کردین چوار کەسەکەش سنووڕداشکرانەوە، کە گەیشتمە بەریتانیا زۆر هەوڵیاندا کە نەگەڕێمەوە بەڵام گەڕامەوەو خواش سەفەرەکەی بۆ ڕەخساندم، چونکە ئامادە نەبووم لەوڵاتی کافراندا بمێنمەوە و سەفەرەکەشم ناچاری بو کۆکردنەوەی خێزانێکی لێك دابڕاو بوو . ئەوەی ڕاست بێ من لەبەر خوا بۆ پاراستنی حەیاو حورمەت منداڵەکانم بۆ برد ، لەبەر خوا نەچوومە ناو بارەکەوە ، لەبەر خواش گەڕامەوە خوای گەورەش فریام کەوت و خۆم و دینەکەمی پاراست .

لەو سەفەرەدا فەسادی و خراپی زۆرم بینی کە پاراستنی دین و ئەخلاق تێیدا ئەستەمە ، ئەوان هاوڕێی سەگ و پشیلەن ، وەك ئاژەڵ بەئاشکرا سواری یەك دەبوون کەهیچ بەهایەکیان بۆ حەیا و حورمەت نەهێشتۆتەوە ، بەداخەوە کەلێرەش پڕو پاگەندەیان بۆ دەکرێ و بەجوان پیشانی ئێمەی دەدەن تەنها لەبەر خاتری دینار و دۆلارەکە ! ئینسان گەر دین و حەیاو ئەخلاقی نەما با گەڵاشی

زۆر بێ لەئاژەڵ کەمترە ، چونکە ئاژەڵان تەکلیفیان لەسەر نییە ، بێگومان ئەوە مشتێ بوو لەنموونەی خەرواریّ .

وتراوە هەرکەس بۆ خوا بێ خواش بۆ ئەوە ،(ابن عباس) خوایان لێ ڕازی بێ ئەڵێ ڕۆژێ لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) بووم فەرموی: من چەند وشەیەکت فێردەکەم بیانپارێزە (إحفظ الله يحفظك ......) رواه الترمذي واتە: سنوورەکانی خوا بپارێزەو دووربکەوە لەقەدەغەکراوەکان خوای گەورە دەتپارێزێ، تۆ ڕووت لە خوای خۆت بێ خوا ڕووی ڕەحمەتی لە تۆیە ، وەبەپێچەوانەوە ئەوەتا لەسەرژمێرییەکی نەتەوە یەککگرتووەکاندا هاتووە کەڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بڵاوی کردۆتەوە ژمارەی ئەوانەی کە خۆیان دەکوژن لەتەمەنی (١١-١٩) ٤٤٪، وەساڵیی ١١٠ملیار دۆلار سەرف دەکات بۆ نەهێشتنی ماددە سڕکەرەکان بەڵام هەر ماندوبوون و مەسرەفەکەی بۆ دەمێنێتەوە ، نیسبەتی ئەو منالأنەی کەلە باوکی خۆیان نەبوون گەیشتۆتە ٧٠٪ ئەگەر کچێ لەتەمەنی ١٥ ساڵیدا کچێنی مابێ بەلایانەوە سەیرە و دەیبەنە لای پزیشکی دەروونی چونکە گومانی نەخۆشی نەفسی لێ دەکەن ...... دەخیل بەری ئەو لافاوە بگرن چونکە دووجار مردنە .

مجلة الأسرة السعودية

# پرۆسـەی خوێندن ...هەڵوێستە و سـەرنج

**بەشی یەکەم: فەلسەفەی خوێندن...**

لەبەر ئەوەی کەپرۆسەی خوێندن پرسێکی گەنجانەیەو خوێنـدن بـۆ گـەنجان وەك چـاوە بـۆ ژیـان، بۆیـە بەپێویـستم زانـی هەڵوێستەیەکی لەسەر بکەم دیارە لەکەس شاراوە نییە کەئاستی زانـست وپـەروەردە لەدابـەزین دایـە لەچاو ڕابـردوو، هـەر چـەندە بۆقەرەبۆ کردنەوەی کاتی دەوامیان پێش خستوەو مەنهەج گۆڕاوە بەوەش سەریان لە قوتابی تێکداوە، بەدیکۆر سیستەمی جیهانی و گـرنگ وجوانـە، بـەڵام شـاری گـەورەو نـاوی وێرانـە، فەلـسەفەی خوێنـدن ئـەبێ فەلـسەفەیەکی ئیمـانی بێـت، نـەك فـول مـاددی وعـەلمانی، بەداخـەوە کـە سیـستەمی پـەروەردەیی پێـشکەوتوو لـەبێ دینیـدا دەبیننـەوەو وانـەی دینیـان تـەواو پـەراوێز خـستوە! کـەدەبوو بەپێـچەوانە بوایـە، بۆیـە دەبـێ لەهـەوڵی بـەردەوام دابـین بۆگرنگی وگێڕانەوەی خۆشەویستی زانست وزانیاری بۆناوهەست ونەسـتی ڕۆڵـەکانمان بـەگیانێکی ئیمـانی، نـەك خوێنـدن تـەنها بـۆ بڕوانامەو بڕوانامەش بۆماددەو ژیان وخۆهەڵکێشان، ئەو کاتە ئەو پزیشکەی لێدەردەچێ کەلە عیادەکەی بەڕوویەکی خۆشەوە دەیـان پرسیارت لێدەکات وگرنگیت پێدەدات، بـەڵام لـە خەسـتەخانە زۆر بەپەلەیـەو وەڵامیـشت ناداتـەوە! ئـەو ئەنـدازیارەی لێ دەردەچێت



کەپاش ماوەیەکی کەم سەقفی بیناکەی درزی بردوە وتەقیوە!یان ئـەو فەرماندەسـەربازییەی لـێ دەردەچـێت کەتەرۆشـك بەیەکەوەدەسوتێنێت،چـەکی هێـشووی وفـسفۆڕی وئـەتۆمی وکیمیایی بەکاردێنێ!لەولاش بێشکەی مافی مرۆڤ ڕادەژێنێ!،یان ئەوماموستایەی لێدەردەچێت کەدەیەوێت لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەی ڕێـك بکـەوێ لەسـەرئەوەی کەهەفتـەی دووردەوام بکـات یـان دەوام نـەکات وموچـەکەیان بـەنیوەیی بـێ! یـان خیانـەت بـە قوتابیـە کـچەکەی دەکـات!یـان فەرمانبـەرێکی لێدەردەچـێت کەجگـە لەموچـەکەی خـۆی بـەرتیلش وەردەگـرێ وەك دەبینـی سـەرەرای پێشکەوتنی ژیان لەبواری ماددی وتەکنەلۆژیاوە هێنانی بڕوانامە لەملاولاوە،بـەلآم لەبـەحری خیانـەت وگەنـدەڵی دا تـەواو سـەرمان لێشێواوەو ژیـان بۆتـە ژان!بەکورتی مـرۆڤ ئەگەر لەگەڵ خواڕاسـت نـەبێت قـەت لەگـەڵ خـەڵکی خـوا ڕاسـت نابێـت و بـەردەوام بیر لـە بەرژەوەنـدی خـۆی دەکاتـەوە لەسـەر حیـسابی خـەڵکانی تـر هـەر چـەندە خـاوەن بڕوانامـەی بـەرزبێت، چـونکە مەبەسـت لەخوێندنەکـەی تـەنها ماددەو ژیـان بـووە!بۆیـە دەبێتـە ئەوکەسـەی کـەدەڵێت: هـی خـۆم بۆخـۆم ئـی تـۆش دەخـۆم!وەك دەبینـی سـەرکردەو وەزیـرو کاربـە دەسـتەکان کـاتێ مـردن خیانـەت وگەندەڵیەکانیان دەردەکەوێت، ناڵێم کەلابران یان خانەنشین کران چونکە ئەوە شمولیان ناکات!!بەلآم لەئیسلامدا فێربوونی زانست

وزانیاری واجبە بۆنێرو مێ بۆ بەرچاوڕونی ژیان بۆپێشکەوتن وداهێنان لەسەرڕێگای ڕاستی ژیان!بۆپزگاربونی خەڵك وڕازی بونی خوا(طلب العلم فریضة علی کل مسلم )ئیسلام بەئوممەتی(اقرا) ناسراوەکەیەکەم فەرمانی خوایە.

بەشی دووەم: بۆسەرکەوتنی پرۆسەی خوێندن دەبێ ڕەچاوی ئەوسێ خاڵە بکەین کەبنەمای سەرکەوتنن بۆخوێندکار:

یەکەم: سەرپەرشتیاری قوتابی کەدایك وباوکەدەبێ لەقۆناغی سەرەتاییدا چاودێری بکات لە خوێندنی ولە هاوڕێکانی سەردانی قوتابخانەکەی بکات...،بەتایبەت دایك کەیەکەم قوتابخانەی پێگەیاندنە ئەگەر لەخواترس بێت زۆر کاریگەرە، پێشەوا(ئەحمەد)ڕەحمەتی خوای لێبێت دایکی پەروەردەی کردبو بەیانیان هەڵی دەستاند بۆ نوێژو نەیدەهێشت بخەویتەوەوهانی دەدابۆسەعی کردنوبوبەو ئیمامەبەڕێزەکەیەك ملیۆن فەرمودەی شیرینی حەزرەتی لەبەربوو!پاشان نمونەی باوکی دڵسۆزحەزرەتی ئیبراهیمە(علیه السلام)کاتێ خوا مژدەی ئیمامەتی پێغەمبەرایەتی پێدا بۆ نەوەکانیشی داواکرد(..ومن ذریتی...)وەکەلەدروستکردنی بەیت بونەوە بۆخۆی وبۆکوڕەکەیشی پاڕایەوەوداوای لەخواکرد کەبەدووربن لەشیرك وبت پەرست(...واجنبنی وبنی ان نعبدالاصنام..)



دووەم: خـــودی خوێنکارەکـــە، کـــەدەبێ تـــەنها پەیوەنـــدی بەخوێندنەوەهەبێت، نەك یاری و ڕابواردن وموّبایل و t.v و ....، بۆ نمونە (ابن الجوزی ) تا ئێوارە لەسەر لێواری دیجلە سەعی دەکرد بـەنان و ئـاو، کولێرەکـەی ئەوەنـدە ڕەق ببـوو کەنەیخـستایەتە نێوئاوەکە نەدەخورا!! (إمام مالك) ماموّستای مەدینەبوو (٤٠٠ . ٥٠٠) قوتابی لە خزمەتیابوون جارێك لەکاتی دەرسا وتیان فیلێك هاتووە بۆمەدینە هەموو یان چوون بۆسەیری فیل کەنەیان دیبوو تەنها قوتابیەکی ئەفریقی نەبێ امام فەرمووی بۆنەچوی بۆسەیری فیل؟ وتی قوربان من بۆ خوێندن هاتووم. لەسەردەمی ڕژێمدا لە دواناوەندی بـوم وتیـان وەرە ببـە بەبەعسی وتم: مـن بۆخوێنـدن هاتووم ونامەوێ سەرقاڵی شتی تربم، بەڵام دوای شۆڕش زۆربەی ئەوانەی بەعسی وفایلدار بون هەرئەوانە بوون بە شت و چونە پێـشەوە ئێمـەیش هــەروەك جـاران! بەداخــەوە ئێـستا لەبــەر پێشبڕکێی خۆشگوزەرانی و حیزبایەتی مادده، قوتابی ناخوێنن لەبیرمـە لـە سـەرەتای هەشـتاکانی سـەدەی ڕابـردوو لەحەوشـە گەورەکـەی مزگـەوتی گولـە کیـانی چـوارقوڕنە ڕاپەڕیـکی سـەعی کردنم دیاری کردبوو ئەوەندە بەسەریا گەڕابووم بۆ سەعی بەهاران شـوێنەکەی مـن وەك خـەتێکی دیـاری کـراو گـژو گیـای لێ شـین نەدەبوو، هاوکات بەهـەژاری ونـەداری توانیمان کۆلێج ببڕین بـەڵام نــەك هەرنەکــەوتم ئیکمــالیش نــەبووم، هەنــدێ لــە قوتابیــە

دەوڵەمەنـدەكان مامۆسـتای تايبەتيـشيان بـۆدەگرن بـەڵام كـەمتر سەركەوتوون لەچاوقوتابيە هەژارەكان، ئەمەش بەهۆی سەرقاڵيان بەخۆشگوزەرانيەوە.

سێيەم: مامۆستا، كاری سەرەكی مامۆستا فێركردنە تێگەياندنە پێگەياندنە..كاری پێغەمبەرانە نەك حيزبايەتی وجياوازی كردن لەنێوان قوتابيـان ورێـزی لەچك لەسـەرنەگرێ ويـان تانـە لـەئايين بـدات وكـوڕوكچ تێكـەڵ بكـات كەئێـستا بۆتـە كێـشەی سـەرەكی ئـەورووپا لەبـەر زۆربـونی منـاڵی ناشـەرعی ولای خۆشمـان بەپێـشكەوتنی دەزانـن! پەنـد لەهەڵـەی وڵاتـان وەرنـاگرن وئارەزووەكانی خۆيـان دەسەپێنن لـەجياتی دڵسۆزبوون بۆنـەوەی داهاتووڕێزگرتن لەئايينی نەتەوەكەيان!مامۆستا دەبێت بەكردەوە مامۆسـتا بێـت وپێـشەنگی ڕەوشـتەجوانەكان بێت،نـەك بـە قـسەی زۆروبـەديكۆر، وەك امـام شـافيعی (ڕەحمـەتی خوایلێبێـت) فەرمويەتی: ان الفقيهَ هوالفقيه بفعلهِ....ليس الفقيهُ بنطقه ومقالهِ.

## سیستەمی پەروەردەی ئیسلامی یان رۆژئاوایی؟!

هەركەسێك ئەركی گەورەی چاكسازی بگرێتە ئەستۆ دەبێ گرنگی بدات بەكاروباری پەروەردە..هەوڵبدات بۆگۆڕینی ئیجابی لەژیانی كۆمەڵگادا بۆ دامەزراندنی كۆمەڵگەیەكی پڕ لەخۆشی وكامەرانی وگونجاو، پەروەردەش ماناوناوەرۆكی گەورەی هەیەو بوارو لایەنەكانی فراوانن، وەك پەروەردەی تاك پەروەردەی خێزان، پەروەردەی كۆمەڵگەوپەروەردەی مرۆڤایەتی..

ستراتیجی پەروەردەی ئیسلامی بۆگۆڕینی مرۆڤەكانە بەئاراستەیەكی راست ودروست وپرۆفیشناڵ، وەك نموونەی هاوەڵان لەپێش ئیسلام و ودوای ئیسلام عومەری پێش ئیسلام وپێشەوا عومەر دوای ئیسلام چەند جیاوازبوون!پەروەردەی ئیسلامی لەناومنداڵدانەوە گرنگی بەمرۆڤ دەدات تا لەدایك دەبێت وسوننەتی هۆزەبانەی منداڵ وبانگ دان بەگوێیداوپەروەردەی خێزانی وپاشان قوتابخانەو پێگەیشتن ودامەزراندن وپیری ومردن ودوارۆژی....،بۆسەرجەم قۆناغەكانی ژیان و مردنی بەرنامەی بۆداناوەو ژیانی بۆرێك خستووە، بەڵام لەبیری رۆژئاواییدا نرخی ژیانی مرۆڤ سنووردارە بۆیە دەبینی لەلوتكەی زانستدا بێزاردەبێت وخۆی ئەكوژێ!دەڵێ بەرهەمم نەماوە!چون بەلای ئەوانەوە پیری ومردن دواقۆناغی ژیانە، بەڵام لای ئێمە مردن قۆناغێكی تری ژیانی مرۆڤە، بۆیە لەتێڕوانینی فەلسەفەی ماددی ستاتەرو هاوبیرەكانیدا بۆژیان دەڵێن ئێمەنازانین لە كوێوە



هـاتووین بۆکـوێ دەچـین!؟بۆیـە سـەرەنجام دووچـاری بێـزاری وسەرلێشێوان دەبن، بەڵام لەئیسلامدا ئەم پرسە یەکلای بۆتـەوە هەرلەهاتنـە دنیاییـەوە تادواهـەواری لـە بەهەشـت یـان لـە دۆزەخ، سیستەمی پەروەردەی ئیسلامی هاوسەنگی ومیانڕەوی ڕاگرتووە بۆ دنیاوقیامەت (...ربنا أتینا فی الدنیا حسنه وفی الاخره حسنه ...)، پاشان پەروەردەی ئیسلامی گرنگی سەرەکی داوەبەزانست و زانیاری کەوشەی (عیلم) وهاوشێوەکانی(٧٧٦) جار لە قورئانـدا هـاتووە خواسوێندی بەقەڵـەم خـواردووە ویەکـەم فـەرمانی پـەیامی ئیسلامی (اقـرا) بخوێنەیـە نـەك نوێـژوڕۆژوو...،ئیسلام کلێسانیە تادژایـەتی زانسـت بکـات و گالیلۆلـەناوببات بەڵکوبەپێـچەوانەوە، بۆیە بـەپیلانێکی پـلان بـۆ داڕێـژراوی نێودەوڵـەتی سـاڵی (١٩٠٧) لەکۆبونەوەیـەکی قەشـەکانی میـسر پاشـان لـە فەلەسـتین سـاڵی (٩٣٥) (زوەیمـر) وتـی: گـرنگ ئەوەیـە بتـوانین موسـڵمانان لەپـەروەردەی ئـایینی دووربخەینـەوە و هـەر بـەناو موسـڵمان بـن هەرچـەند نەبنـە مەسـیحیش! ئـیتر لـەو ڕۆژەوە لـەکاردان بـۆ پراوێزکـردن ونەهێـشتنی پـەروەردەی ئیـسلامی بـە هـۆی دەیـانی وەك: سـاتع عومـەری ومـسس بیر لـەعێراق وگلـول پاشـا لـەئوردن وکرۆمــەر لەمیــصرو ئەلــەنبی لەســوریا، تاکوتوانیــان هــەموو پەروەردەی ئیسلامی بکەنەکتێبێکی بچوکی (٢٠)لاپـەڕەیی کە بـۆ تاقیکردنەوەش داخل ناکرێ! بەڵام دوای ئاشکرابونی زیانـەکانی پــەروەردەی لائیکــی بەتێکــەڵاوی کــوڕان وکــچان لــەدامودەزگاو قوتابخانــەکان کــەبۆیان بــو بەکێــشەیەکی گــەورە لــە ڕۆژئــاواو

ئـەورووپا، وەك نوسـەری بـەناوبانگی ئینگلیـزی(دیكـۆك) دەڵـێ: تێكـەڵی ژن وپیاومنـاڵی بێبـاوك و گەنـدەڵی ئیـداری وفەسـادی ئـەخلاقی زۆری لێكەوتـەوە، بۆیـە خـەڵكی ئێـستا بەرەوئیـسلام دەگەڕێنەوە ویاساكانیشیان هەرهی ئیسلامە بەڵام بەناوێكی تری خۆیان، وەك لە محمد عبده دەگێڕنەوە كەوتوویەتی: لەئەورووپا ئیسلامم بینی بێ موسوڵمان بەڵام لەڕۆژهەڵات موسڵمان دەبینم بەبێ ئیسلام!زانایان پێشبینی ئەوایان كردوە كەلەسەدەی (٢١) دا ئیسلام لەئەورووپاوە بۆمان دەگەڕێتەوە!، چونكە ئەوان لەدیدێكی مەعریفی یەوە بۆ سستەمی پەروەردەی ئیسلامی دەڕوانن، بۆیە كەسێكی وەك (مایكڵ وۆڵف)لەڕۆژنامەی (میدیامۆناتۆریس)لە ٢٠٠١/٦/١١بابەتێكی نوسیوەبەناونیشانی ( islam the next amrkan relegon) واتە:ئیسلام ئاینی داهاتوی ئەمریكایە، وەڕۆژنامـــەی (times sandey)ی بـــەریتانی لـــە ٢٢/٤/ ٢٠٠٤نووسیویەتی كە زیاتر لە(١٤) هەزارسپی پێستی بەریتانی موسڵمان بوون بەهۆی بێزاری ونائومێدیان لەبەهای ڕۆژئاواییەكان كە لە ناو ئەواندا كەسایەتی ناوداری(جۆناسان بێرت)ی تێدایە كە كوڕی(لۆردبێرتی)بەڕێوبەری پێشوی (B.B.C)، سەیرو سەمەرەیە كە تازە دەیانەوێ بەری خۆربەبێژنگ بگرن ولێرەولەوێ دینەكەمان بەكۆنەپەرسـت ودواكەوتووتۆمەتباردەكـەن!جگـە لـەدەیانی وەك زانـای مەجـەڕی (جرمـانۆس) كەهەشـت زمـان دەزانـێ و (١٥٠) كتێبـی نووسـیوە لەلوتكـەی زانـستەوە موسـڵمان دەبێ،ئـەم دینەخاوەنەكـەی خوایـە بۆیـە هـەرگیز لـەبن نایـە گـەرنا



دەبوونەمابایە،سیستەمی پەروەردەی وڵاتی ئێمە لەخزمەت گەنج ولاوەکاندا نییەچونکە دامەزراندن لەدامودەزگاکاندا لەسەربنەمای تەزکیەی حیزبی بووە لەجیاتی پسپۆڕی ودڵسۆزی و هاوڵاتی بوون کەئەوەش ڕێگربووە. لەخستنەگەڕی تواناکانیان لەشوێنی شیاوی خۆیان، جیگەی سەرسوڕمانە کە لەکوردستان پەند لەهەڵەی وڵاتانی ئایدز وەرناگرن وتازەبەتازە سیستەمی سویدی دەسەپێنن بەسەرگەلێگی موسڵماندا کەپێچەوانەی بیروباوەڕی کوردانە!لەتێکەڵاوی کوڕان وکچان وپەرایزکردنی دینەکەوتەنانەت زەمینەو زەمانیشیان بۆ نەڕەخساندووەوچەند قوتابخانەیەکی نمونەییان قوتکردۆتەوە بۆڕاگەیاندن ودنیایەك قوتابخانەی بێنازوبێ خزمەتمان هەیەو کێشەی بیناوکەمی مامۆستای پسپۆڕوگۆڕینی مەنهەجیش سەری لەقوتابی مامۆستاش تێکداوە! لەڕاپرسیەکی ڕادیۆی نەوادا ساڵی( ٢٠٠٨) ئەنجامی دابوولەهەرێمی کوردستان سەبارەت بەهەڵبژاردنی سیستەمی ئیسلامی یان عەلمانی؟سەرەڕای ئەوهەمووچەواشەکاریە(٠/٠٨٣)دەنگیان بۆ سیستەمی ئیسلامی دابوو، ماوەتەوە بڵێین: تاچەند کوڕان وکچانی موسڵمان پەروەردەکراون وئامادەنەبن کەبەتێکەڵاوی بچنە پۆلەکانەوە، یان کەناچاربوون تا چەند ڕەوشت وکەسێتی خۆیان دەپارێزن؟.

## ئازادی یانی چی ؟

لەبەر ئەوەی زۆر لە گەنجەکانمان بەناوی ئازادییەوە لاڕێ بوون و فریو دراون ! چەمکی ئازادییان شێواندووە و ئەمڕۆ دەبینی بۆتە بەرەڵلایی و بێ بەند و باری و گوێ نەدان بە هیچ شیرازە و سنوورێکی خودایی و ئینسانی، وەك ئایین و ڕەوشت و عورف و عادات ، ئەمەش فەلسەفەی (الوجودیە) یەو بە زۆر بەسەر وشەی ئازادییان دا بڕیوە ،

چون بەرەڵلایی ئاژەڵایەتییە ، بۆیە بە پێویستم زانی پێناسەیەکی کورتی ئازادی بکەم ٠

پێناسەی ئازادی لای ڕۆژئاواییەکان: (هەر کەسێك هەرچی حەز دەکات بیکات بەمەرجێ زیان بەکەسانی تر نەگەیەنێ) واتە ڕێز لە بەرانبەرەکەی بگرێت و مافی پێشێل نەکات، ئەمە ئەڵێن بەلام واناکەن و ئەوەتا خۆیان سەپاندووە بەسەر جیهاندا ئەوەی لەگەڵ بیروبۆچونی ئەوان نەبێت تیرۆرستە یان دواکەوتووە .

پێناسەی ئازادی لەئیسلامدا : (واتە هەرچی حەز دەکات بیکات بەمەرجێ زیان بەخۆی وکەسانی ترنەگەیەنێ) واتە: خۆی بپارێزێ لەدووجۆرە زیان :

زیان لەکەسانی تر نەدات وەك کوشتن و لێدان و ماڵ داگیر کردن و بوختان و درۆو سەرجەم خراپەکان.

– زیان لەنەفسی خۆشی نەدات کەئەویش دوو جۆرە : زیانی دنیایی : وەك خۆکوشتن و خۆسووك کردن و ماڵی خۆ بەفیڕۆدان ....، زیانی قیامەتی : وەك بێ فەرمانی خواو پێغەمبەر ، ئەنجامدانی تاوان و خراپەکە دەبنە ئەگەری سزای دواڕۆژ . (١،٢)
کتاب الاخلاق ص ٢٠٠ احمد امین

ئازادی مافی ڕەوای هەموو کەسێکە، بەمەرجێك لەشەرع دەرنەچێ ، وەك لە پێناسەکەدا هاتووە ڕێز لەخۆی و کەسانی تریش بگرێت و مافی بەرانبەر پێشێل نەکات.

ئەوانەی بەدرۆ یان بەنەزانی ئیسلام تۆمەتبار دەکەن کەگوایە ئازادی تێدا نییەو بەزەبری شیرو تیر بەسەر خەڵکیدا سەپێندراوە زۆر بە هەڵەدا چوون، چونکە خوا بەڕاشکاوی فەرموویەتی: ﴿لا اِکراهَ فیِ الدین...﴾ واتە :لەوەرگرتنی ئاییندا هیچ زۆرە ملێی تێدا نییە نابێت بەزۆر بێت .

ئیسلام دەیەوێ هەموو کەس بەئازادی بژیەت ، هەروەك چۆن بەئازادی لەدایك بووە، نەیەڵێ هیچ کەس ئازادی لێ زەوت بکات و بیچەوسێنێتەوە، وەك خوای گەورە فەرمویەتی:﴿لاتظلمون ولا تظلمون﴾ واتە: نەزوڵم بکەن وەنەزوڵمیش قبوڵ بکەن. بەلأم ئازادی سنوردار، چونکە ئازادی ڕەها لە بەرژەوەندی مرۆڤەکاندا نیەو زیانبەخشەو پشێوی وبەرەلایی لێدەکەوێتەوە، وەك چۆن سەیارەیەك بەناوی ئازادیەوە مل بنێ وپابەند نەبێ بەیاساکانی هاتوچۆوە سەرنشینەکانی تیائەچن، بەلأم ئازادی سنوردار وەك



ئەو شەمەندەفەرە وایە کە لەسەرسکەو خەتی خۆی دەڕوات وسنوورەکەی خۆی ناشکێنێ وسەلامەت دەبێت.

عومەری کوڕی خەتتاب (خ) بەدەسەلاتدارێکی فەرموو کە ستەمی لە هاولاتییەکی هەژار کردبوو : ( ئەوە لە کەیەکەوە خەڵکتان کردووە بەکۆیلە ! کەبەئازادی لەدایك بوون ؟!دیارە بەشەکانی ئازادی زۆرن بەڵام دەتوانین هەموویان کورت بکەینەوە لەچوار بەشی سەرەکیدا کەئەمانەن:

١- ئازادی لە کۆیلایەتی. ٢- ئازادی گەلان. ٣- ئازادی شارستانی. ٤- ئازادی ڕامیاری ،کە بوار نەبوو ڕونیان بکەمەوە.

ئەمە بەکورتی بەرکوڵێك بوو لە ڕونکردنەوەی چەمکی ئازادی، کەبەداخەوە ئێستا بۆتە دروشمی داگیر کەران و زلهێزەکان بۆ فریودان و لادانی گەنجەکان و دەست بەسەراگرتنی گەلان، گەرنا ئازادی ڕاستەقینە تەنها لەئیسلامدا بیبینە، مێژوی ڕابردوومان زێڕینە.

شاعیریش جوانی وتووە کە دەڵێ:

هەمیشە پەژارەم لە بۆ کوردانە
دەبێ کەی شادبم بەئازادی ئەم نیشتمانە
ئازادی وسەربەخۆیی بڕیاری خودای ڕەحمانە
یەکسانی وەکوشانە، فەرمودەی پێغەمبەرمانە
سیرەتی تەهاوقازی ومستەفاو محمودی قارەمانە
جیهادو خەبات بۆ گەلی کوردو ئەم نیشتمانە

# ژیانی ڕاستەقینە کامەیە ؟

ژیانێکمان هەیە بەمانای خواردن وخەوتن ورابواردن کەلە(عَیش ومَعیـــشَة)، یەکەســـەرجەم گیانلەبـــەران دەگرێتـــەوە بـــەمرۆڤو ئاژەڵانیـشەوە، بگـرە ئـاژەڵان چـێژی زیاتریـشی لێدەکـەن، ئـەو جۆرەیـان بۆمرۆڤەکان وەك مردووایە چونکە بێ ئامـانج وهیوایـە، بەڵام ژیـانی ڕاسـتەقینەی بەمانای(حیاةً طیبةً) کە دەزانـێ بۆچـی دروسـتکراوەو بۆچـی دەژی؟ ئـەوە کەسـی بـڕواداره ئامانجـدارە، کەواتە مانای (سەلامەتی، حورمەت، سەربەرزی وهەنگاونان بەرەو ئامـانجی دیـاریکراو) ئەمـەش مەبەسـت وئامانجـەکانی شـەریعەتی ئیسلامە بۆ پاراسـتنی پێـنج شـتە گرنگـەکانی ژیـان، کە زەوی بـەم پێنجە ئاوەدانە (ئەقڵو دیـنو مـاڵو وەچـەی مـرۆڤو لاشـەی مـرۆڤ) بەنەمانی هەرکام لەمانە ، ژیان ژانە سەر ئێشانە :

١- بۆ پاراستنی(عەقڵ) هەموو سەرخۆشکەرێکی حەرام کـردووە و سزای دارلێدانی بۆ داناوە .

٢- بۆ پاراستنی ( دین) جیهادی داناوە .

٣- بۆ پاراستنی (ماڵ و سامان) هـەموو مامەڵەیەکی نادروستی وەك (غـــەش و خیانـــەت و درۆو دەســـت بەســـەراگرتنی) حـــەرام کردووە .

٤- بـۆ پاراسـتنی (وەچـەی مـرۆڤ) زینـا و داوێـن پیـسی حـەرام کردووە (حەددو ڕەجمی) بۆ داناوە .



٥- بۆ پاراستنی (گیانی مرۆڤ) كوشتنی ناهه‌قی حه‌رام كردووه و (قصاص) تۆڵه‌ی بۆ داناوه .

مرۆڤی موسوڵمان ژیانی دنیا به‌جێگه‌ی تاقی كردنه‌وه ده‌زانێ و كێڵگه‌ی دوا ڕۆژه و چاكه‌ی تێدا ده‌چێنێ ، به‌ڵام ئه‌وه‌ی لای موسوڵمان شتێكی هه‌ڵه و نا په‌سه‌نده ئه‌وه‌یه كه ژیانی دنیا بگرێته ئاوات و ئامانج ، وه‌به‌سه‌ر دواڕۆژدا هه‌ڵبژێردرێ ئه‌وه‌ش خه‌سڵه‌تی كافرانه ،وه‌ك خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی : (وويل للكافرين من عذاب شديد الذين يستحبون الحياة الدنيا على الاخرة ..) ابراهيم (٢،٣)

واته : هاوار بۆ كافران له عه‌زابی توند ، ئه‌وانه‌ی كه‌ژیانی دنیا به‌سه‌ر دواڕۆژدا هه‌ڵده‌بژێرن ، به‌داخه‌وه ئێستا به‌خته‌وه‌ری كه‌م بووه به‌هۆی سه‌رقاڵ بوونی زۆرینه‌ی خه‌ڵك به پێشبڕكێی دنیا داری باس باسی (مۆدێل و مۆبایل و خانوو سه‌یاره و ......)

ژیان بۆته كۆكردنه‌وه و بایی بوون و خۆ سه‌پاندن ،، بێ ئاگابوون له ژیانی دواڕۆژ !.

بێگومان خوای دانا و زانا ئه‌م دینه‌ی بۆ به‌رژه‌وه‌ندی مرۆڤه‌كان ناردووه ، تا ژیانی دنیا ودواڕۆژیان به‌خته‌وه‌ربێ، له‌به‌رئه‌وه ده‌رمانی هه‌موو ده‌رده‌كانمان گه‌ڕانه‌وه‌یه بۆ دینی خوا وه‌ڵام دانه‌وه‌ی بانگه‌وازی خوا و پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) (يا ايها الذين آمنوااستجيبوا لله وللرسول اذا دعاكم لما يحييكم )الانفال



واتــه: ئــه‌ی ئــه‌و كه‌ســانه‌ی ئیمانتــان هێنــاوه، وه‌ڵامــی خــوا و پێغه‌مبه‌ری خوا بده‌نه‌وه ، كاتێ پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) بانگتـان ده‌كات بـۆ ئه‌و شتانه‌ی كه‌ژیانتان بۆ دروست ده‌كات،(حیاه) ژیـانی فكـر و عه‌قڵ و ژیان بۆدڵ و سۆزتان ، ژیان بۆ خێزان و منداڵتـان، ژیـان بـۆ گـه‌ل و میللـه‌تان، بـه‌ره‌و ژیـانی هه‌تاهـه‌تایی ودواڕۆژ : (وإن الـدار الأخره لهی الحیوان لو كانوا یعلمون) .

گــه‌نجانی خۆشه‌ویــست و بــه‌توانا وه‌رن لــه ئیــسلام تێبگــه‌ن و پێبگه‌ن ، به ڕێبـازی ئیسلام خزمـه‌ت به‌ژیانی خۆتـان وگه‌له‌كه‌تان بكـه‌ن، بـه‌ره‌و سـه‌رفرازی و به‌ختـه‌وه‌ری، بـه‌ره‌و ژیـانی سـه‌روه‌ری به‌ره‌و لای خوا ڕێگه بگری، تـاوه‌كو لـه‌و گه‌نجه خۆشه‌ویستانه بن كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌باره‌یانـه‌وه فه‌رموویـه‌تی:(ما من شئ احب الی الله من الشاب التائب).

## پەڕەیەكی نوێ

زۆرجـار گـەنج بڕیـار دەدات بەهەڵدانـەوەی لاپەڕەیـەكی تـازە لەژیانیدا و بگەڕێتەوە بەرەو چاكەكاری ، بەڵام ئەمە دەبەستێتەوە بە شتێكی نادیار ! دەڵێ كەوەزعم باش بوو یان كە ژنم هێنا یان كەخوێندنم تەواو كرد تەوبە دەكەم كە ئەوە خەیاڵێكی خراپە چونكە مردن لەناكاو دێت، بەڕێزەكەم سەرفرازی خۆت مەبەستەوە بە شتێكی هات و نەهات و نادیار، حازر بەقەرز مەدە تا زوتر تەوبە بكەیت چاوێ بە ڕابردوودا بگێڕییەوە و پاشان دواڕۆژێكی پرشنگدار بۆ خۆت مسۆگەر بكەی چاكترە، هەمووشمان تاوانمان هەیە، بەڵام وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:(كل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابون) واتە: هەموو ئادەمیزاد هەڵەو تاوان دەكەن، بەڵام چاكترین تاوانبار ئەوانە كەتەوبە دەكەن .زۆرن ئەوانەی كە خوا ڕێنموێنی كردوون و لە خراپەكانی ڕابردوویان پەشیمان بونەوە پاشان دانیان بەوەدا ناوە كەلەزەت وخۆشی تەنها لە ژیانی ئیمانی دایە و ژیانی ڕابردوویان گومان و دوودڵی بووە فەرموون ئێوەو هەندێ لەو نمونانە:یاریزان (عبدالله عەبدربە) بەهۆی چەند قوتابییەكی موسڵمان گەڕایەوە لە ژیانی دوور لە خوایی و بێ ئاگایی، ئیستا هەست ئەكەم زۆر بەختەوەرم .(عەبدوللە سەریح) ئەكتەرێكی ناسراوی میسری بووە ، دوای تەوبەكردنی ئیستا بانگدەری مزگەوتە لە قاهیرە ، ئەڵێ: سوێند



بـــه‌خوا ئێـــستا هه‌ســـت بـــه‌ئارامی دڵ و به‌ختـــه‌وه‌ری ده‌كـــه‌م، ئێـــستاده‌زانم كه‌ژیانـــه‌ ڕابـــردووم گـــومڕایی و خراپـــه‌ كـــاری بووه،مۆسیقا ژه‌ن (فهد سعید)دوای گه‌ڕانه‌وه‌ی ده‌ڵێ:به‌خته‌وه‌ری و ڕێزی دنیا وقیامه‌ت ته‌نها له‌ئیمانداری دایه‌ هه‌رگیزنه‌مده‌زانی به‌و شێوه‌یه‌یه،چـونكه‌ مـن ژیـانی خراپـه‌كاریم گوزه‌رانـدووه‌ تـاقی كردنـه‌وه‌ چـاكترین به‌ڵگه‌یه،پێـشینانیش وتویانـه‌ (سـه‌د حـه‌كیم به‌قه‌د ده‌رده‌دارێك نازانێ)بانگه‌وازی گه‌نجه‌كان ده‌كات وده‌ڵێ:ئه‌ی كۆمه‌ڵی گه‌نجان به‌خته‌وه‌ری له‌ گه‌شت و گوزاردا نییه‌، له‌خواردن وخواردنه‌وه‌دا نییه،له‌ خۆده‌رخستن وبایی بوندا نییه‌، به‌ڵكو ته‌نها له‌ گوێڕایه‌ڵی شه‌رعدایه‌. شاعیریش جوانی وتووه‌ :

ئه‌مڕۆ دنیایه‌ سبه‌ی قیامه‌ت — چاوێ بگێڕه‌ به‌ ڕابردووی خۆت
توێشوی سه‌فه‌رت بزانه‌ چۆنه‌ — شتێكی وا بێ سوودی ببێ بۆت

## شبابنا الى اين – عادل بن محمد

وه‌رده‌ی ئیمانی زۆربه‌ی هه‌ره‌ زۆری گیرو گرفت و كێشه‌ كانمان له‌ سۆنگه‌ی گونـاح و هه‌ڵـه‌ و لادانـی خۆمانـه‌وه‌ سـه‌ر هه‌ڵـده‌ده‌ن ، تاوان و خراپه‌ ماڵ وێرانی دنیا و دوا ڕۆژه‌ ، له‌ دنیـادا ئـه‌و هـه‌موو قه‌یرانـه‌ سیاسـی و ئـابووری و كۆمه‌لاّیه‌تییـه‌ ده‌بینـی و ده‌بیـستی كه‌لـه‌ ئـه‌نجامی لاریـو خوارییه‌وه‌یـه‌، له‌دواڕۆژیـشدا سـزای تونـدی دۆزه‌خی له‌دوایه‌ .

چاره‌ســه‌ری ســه‌رجه‌م گرفـت و كێـشه‌ كانمـان گه‌ڕانه‌وه‌یـه‌ بـۆ قورئـان و ســوننه‌ت بـه‌و شـێوه‌یه‌ی كـه‌ پێـشینانی ئێمـه‌ تێـی گه‌یـشتوون نـه‌ك دینێكـی ڕواڵـه‌تی و چـاولێكه‌ری گه‌ڕانـه‌وه‌ بـۆ

په‌روه‌رده‌یه‌کی ئیمانی نه‌وجه‌وانان و منداڵه‌کانمان بۆ پێگه‌یاندنی نه‌وه‌یه‌کی نوێ ، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته پێویسته به ئاگابین له‌مه‌ترسییه‌کانی تاوان و هۆیه‌کانی لاوازی ئیمان : زیان و شوێنه‌واره‌کانی تاوان و خراپه :

بێ به‌ش بوون له زانست و زانیاری ، چونکه عیلم نووره ده‌چێته ناو دڵی به‌نده به‌ڵام گوناح کردن ئه‌م نووره ده‌کوژێنێته‌وه ، وه‌ك ده‌بینی ئه‌مڕۆ عیلم ڕێزی نه‌ماوه و دڵیان به‌لای خواردن و ڕابواردنه‌وه‌یه و به‌س ، به‌و هۆیه‌وه دووچاری ده‌ردی بێ ئاگایی و نه‌زانین بوون ، واش ده‌زانن که‌ده‌زانن ..!

نه‌مانی به‌ره‌که‌ت و که‌م بوونی ڕزق ، هه‌رچه‌نده جاری وایه پاره زۆره به‌ڵام جێگه ناگرێ و فریای ناکه‌وێ

مرۆڤی خراپه‌کار له ناخی دا هه‌ست به دڵه‌ڕاوکێ و دڵڕه‌قی و نامۆیی ده‌کات و تام و چێژ له خۆشییه‌کانی ناکات .

گوناه گوناهێکی تر به‌دوای خۆیدا دێنێ وه‌ك وتراوه (خراپه خراپه‌ی له‌دوایه) تا له‌ئه‌نجامدا سه‌رگه‌ردانی ده‌کات .

وا له‌به‌نده ده‌کات که‌به‌ره‌و تاوان بچێت و پشت له ته‌وبه کردنی بکات و عه‌زیمه‌تی ناهێڵێ .

ئه‌و که‌سه‌ی ده‌که‌وێته ناو تاوان و خراپه کارییه‌وه دواتر تاوان به‌لایه‌وه ئاسایی ده‌بێت تا پێی به هیلاك ده‌چێ .

ئەنجامدانی هەر تاوانێ نوکتەیەکی ڕەشە لەسەر دڵ ، تاکوو تەواو دڵی ڕەش دەبێت و بەندە دەباتە ڕیزی غافڵ و بێ ئاگایانەوە

گوناه و خراپەکاری وا لەبەندە دەکات کە خوای گەورەی لەبیر بچێتەوە ، خواش ئەو فەرامۆش دەکات وەك دەفەرموێت ((ولا تكونوا كالذين نسوا الله فانساهم انفسهم ...))

تاوان وخراپە هۆکاری تووڕەبوونی خوایە وترس وخەفەت دەبێ، بەکورتی تاوان دەردی دڵانە وەك لەبەرامبەردا تەقوا وچاکەکاری خۆراکی دڵانە .

## هۆیەکانی لاوازی ئیمان

شەرم نەکردن لەخوا هۆکاری ئەنجامدانی تاوان و خراپەیە کە سەرچاوەکەی لاوازی ئیمانە بۆ ئەوەی سەرکەوتووبین لە پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ ی پەروەردەکراوی ئیمانی ،پێویستە هۆیەکانی لاوازی ئیمان بزانین و خۆمانی لێ بپارێزین ، کە ئەمانە هەندێکیانن :

دوور کەوتنەوە لە تێکەڵی ئیمانداران ، بێگومان ئینسان دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو دەستە و تاقمەی کە لەگەڵیاندا دەژی ، تێکەڵی خراپەکاران و بێ بڕوایان دڵ ڕەق دەکات و ئیمان سست و لاواز دەکات و سەر ئەنجام دەچێتە سەر دینی ئەوان، وەك لە کاریگەری هاوڕێیەتیدا ئاماژەمان پێکرد

بیرنەکردنەوە لە ڕۆژی دوایی :



کە دەبێتە هۆی ئەوەی خەم ساردبێت لەتوێشوی دواڕۆژو دورکەوتنەوەی لە چاکە، وردە وردە بەرەو خراپە خاری و لاوازی بیروباوەڕی دەبات ، بێگومان ئیمان بە تاوان وخراپە لاواز دەبێت بەچاکەکاری بەهێزدەبێت .خۆشەویستی دونیا:کەسەرچاوەی هەموو خراپەیەکە، هەرچەندە دنیا خۆشە و شیرینە بەڵام موسوڵمان توێشووکۆ دەکاتەوە بۆ مردنێ کە ژیانی لە دوایە، نەك دڵخۆش بێ بەژیانێك کەمردنی لەدوایە، وەکو سێبەری داروایە دنیاویسەکانن تەنهاهەوڵیان بۆ دنیایە، کێشەی ئەمرۆی ئێمە دنیاویستیە بۆ حەزمان لەپێچەوانەبایە!! بەدنیا سەرقاڵ بوون لەدینداری دوورمان دەخاتەوەو ئیمانمان کزو لاوازدەکات .لەبەر ئەوە دنیا بەکەم گرتن (الزهد) چارەسەرە نەك واز هێنان لە دنیا ، (لە دنیا چیت بەکۆڵەوە بێ لە ئاخیرەتدا ئەوەت بۆ دەکێشن)

ژیان لەدەوروبەرێکی نەفامیدا :

بێگومان دەوروبەر کاریگەری زۆری هەیە لە ئاراستە کردنی مرۆڤ بەرەو چاکە یان خراپە ، گەر لەناو جەوێکی گۆرانی و هەڵپەرکێ و فاحیشە و خراپەکاری دا بژی بەرەو خراپەت دەبات و باوەڕت لاواز دەکات وە بەپێچەوانەوە ، سەرنج بدە ئەوانەی کەدوای چەند ساڵێك لە دەرەوە دێنەوە بەشی زۆریان ڕەسەنایەتی خۆیان لەدەست داوە و لە شێوە و نەریت و جل و بەرگدا بونەتە ئەورووپی !جا ژیان لەناو کۆمەڵگەی نەفامیدا بەرەو نەفامیت دەبات و ئیمانەکەت لەدەست دەدات .



لەگەڵ نامەردا مەچۆرە کایە　　ڕەفیقی ناکەس بەلای لەدوایە
یاری بە ئاگر، یا ڕەفیقی مار　　سەرئە نجامەکەی هەر واوەیلایە

نەبونی چاو ساغ و مامۆستای شەرعی . بۆ تێگەیشتن وپێگەیشتن پێویستە مامۆستا وڕێگە پیشاندەرێکت ببێ،چون ئەگەر بەبێ زانیاری وشارەزایی بکەویە ڕێ، ئەوە ڕێگە ون ئەکەیت و ناگەیتە مەنزڵ و مەبەست، شەیتانەکانیش گیرۆدەی کەندەڵان و هەڵدێرت دەکەن .

کۆتایی دێنم بەم چەند دێڕە لە پاڕانەوەی مەلا ئەحمەد قامیشی باپیرەی دووەمی (نووسەرە) کە لەساڵی (١٨٥٤) زاینی واتە بەر لە(١٥٠) ساڵ بەخەتی خۆی لەکۆتایی یەکێ لە نوسینیەکانیدا لە گوندی (گولەك) نوسیویەتی وتیایدا لەخوا ئەپاڕێتەوە لەتاوان و کەموکورییەکانی ببوورێت، بەندەیش هەربەو شێوە لەخوا ئەپاڕێتەوە.... ئەمەش وێنەی لەبەرگیراوەی هۆنراوەکەیە کەدوا خەتی سەلاوات دانە لەسەر پێغەمبەرﷺ

وَاسئلُ العفو عَنِ التقصيرِ　　وَ خَيرَ ما يؤَمَلُ فى المصيرِ
وَغَفَر ما كانَ مِنَ الذّنوبِ　　وَسَتَر ما شَانَ منَ العُيُوبِ
وَأفضَلُ الصلواة وَالتسليمِ　　على النبىِ المُصطفى الكريمِ
مُحمدِ خيرِ الانامِ العاقِبِ　　وَالهِ الغُرذوى المناقِبِ

## نووسەرلەچەند دێڕێکدا

- نەوەی مەلاگردەو مەلامحمدی قامیشیەو لەساڵی (١٩٦٦)لە چوارقوڕنە هاتۆتە دنیا.

- پەیمانگای ئیسلامی لەسلێمانی وکۆلیژی شەریعەی بەغدای خوێندووە تا٨٩

-ساڵانی(١٩٩٠-١٩٩٨)لەم مزگەوتانە مەلا بوە (جافان، گولەك، دواوە) لەبیتوێن.

- ساڵانی (١٩٩٨-٢٠٠٢)مامۆستای پەیمانگای ئیسلامی زانستەشەرعیەکان بووەلەهەڵەبجەی شەهیدلەگەڵ ئەوەشداپێش نوێژی مزگەوتی (دارالصفاو ،پاشا)بووە

- ساڵی (٢٠٠٢)گەڕاوەتەوەشاری سلێمانی ولەمزگەوتی (شەفیق بەگ)جێگیربووە.

- ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانە لقی سلێمانییە.

## ناوەڕۆک

هەردەم لە چاوەڕوانی بەرهەمی نوێ دابن

# کتێب باشترین هاوڕێتە

گەنجانمان

بەرەو کوێ ...؟

نووسینی

مەلا ئەحمەدی قامیشی

سێیەم چاپ

هەولێر 2010

مادام لاوان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن
لەگۆڕانکارییە ڕامیاری و
کۆمەڵایەتییەکانداو جڵەوی کۆمەڵگە
بەدەستیانەوەیە بەرەو هەر مەنزڵێکی،
بەرن بەختەوەری بێت یان بەدبەختی،
کەواتە دەبێت بایەخێکی زیاد بە
نەوجەوانان ولاوەکانمان بدەین کەنومێدی
نەتەوەکەمانن، بەرنامەی دروستیان
بۆدارێژین، ڕێگە نەدەین بێ ئامانج
لەژیانیاندا بسوڕێنەوە، یان خەڵکێکی
دەروون نەخۆش بەبیرو بۆ چوونی
لاروخوارەوەهەڵدێریان ببات.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر